


# دڵدار

## شاعیری شۆڕشگێڕی کورد

نووسینی: عبدالخالق علاءالدین

به یارمەتی ئەمینداریتی ی گشتی ی رۆشنبیریو لاوان لە چاپ دراوە

نووسینی : عبدالخالق علاءالدین

# دڵدار

# شاعیری شۆڕشگێڕی کورد



**ئەی رەقیب هەر ماوەقەمی کورد زوبان نای رمێنی**
**دانەیی تۆپی زەمان ئیمە رۆڵەی رهنگی سوورو شۆرشیز**
**سەبریکە خوێناویە رابوردومان**

## پێشەکی

دەمێك بوو تاسەو ئارەزووی ئەوەم بوو ـ بەڵکو دەتوانم بڵێم لە ئاواتە بەرزو پیرۆزەکانم بوو ـکە بتوانم بەرهەمی ئەدەبیو شیعرەکانی دڵدارم دەست بکەوێتو

بە چاپی رابگەیەنم، چونکە دەمزانی جگە لە شیعرە چاپکراوەکانی بەرهەمی ئەدەبی پڕ سوودی ئەوتۆی تری وای هەیە کە پایەیەکی‌تر لە جیهانی ئەدەب دەداتە دڵدار. وە ساڵەهای ساڵە ئەم یادداشتو شیعرو بەرهەمە ئەدەبیانەی کە شاعیر بەدەستی خۆی نووسیویەتی ئەم ماڵو ئەو ماڵ، ئەم دەستو ئەو دەست دەکات ،وە کەوتبوە بەر مەترسی تیرو پلاری چەرخی چەپگەرد. لەوانەش بوو رۆژێ لە رۆژان شالاوی هاتو باتی کارەساتی زەمانەش دەسگیری بێو رەنجو گەنجی نرخداری ئەو شاعیرە بلیمەتەمان لە دەست بدات.. هەر وەك گەلێ گەنجینەی بەرهەمی پڕ بەهای شاعیرانی ترمان لەکیس چووە. دەبێ ئەوەش لەبیر نەکرێ گەر دڵسۆزیو قەدرزانی مامۆستا (مەجید رەؤوف)ی برای دڵدار نەبووایە کە ٣٢ ساڵ رەبەق وەك کۆرپەیەکی نازداری بەناز ئەم دیوانەی هەڵگرتووە.. دەنا لای یەکێکی کەمتەرخەمو نەخوێندەوار بوایە، بێگومان نەدەماو بەئاسانی لەناو دەچوو ، مەگەر هەر خواش بۆخۆی بزانێ لەپێناوی پاراستنیدا چەند تەنگو چەڵەمەی تووش هاتووە! ..[1]

● ● ●

وەنەبێت تەنیا هەر من بیرم لەوە کردبێتەوە بەڵکو لەو رۆژەی کە وەیشومەی مەرگ دڵداری لە باوەشی

---

(١) خوشکە نەرمین ئاسەف دەڵێ :-

بەرهەمەکانی دڵداری مامم هەموو نێوارەیەك وەك کورپەی ساوا لە هاونیان دەمان بردە سەربانو سبەینانیش دەمان هێناوە ناو سندوقێك .

ژیاندا هەلگرت تا ئەمرۆ گەلێ لە خزمو دۆستانی نـزیکی دلدارو زۆر لە نووسەرو ئەدیبان بە ئاواتی بەدی هێنانی ئەم ئەرکە پیرۆزەوە بوون، وەك ئەو نیازو ئارەزووەی لەدڵی مندا بووە لەدڵی چەندەها کەسانی تریشدا بووە.. وە گەلێ لە برایانی ئەدەب دۆست بیریان لەوە کردۆتەوەو هەوڵی لەچاپدانی ئەم دیوانەیان داوە.

مامۆستا مجید رؤوف لە ساڵی (١٩٥٧) دا بە پوختی هـەموو بـەرهـەمـەکـانی شـاعیـرو بـە پێشـەکیـەکی لێوەشاوەوە کە لە لایەن دڵزارەوە نـوسرابـوو دەداتە خـوالێ خۆش بـوو مامـۆستا گیـوی مـوکـریـانی تـا لە چاپخانەکەی (کوردستان) لە هەولێر چاپی بکـات،کەچی تەنیا شیعرەکانیو پێشەکیەکەیشی بەناوی خۆی بـلاو دەکاتەوەپاش ئەمە لە ساڵی ١٩٦٨دا وەك مامۆستا مجید دەڵێ: هەرچی بەرهەمی ئەدەبی کە دڵدار بەدەستی خۆی نـووسیبووی سـەراپـا هـەمـووی دەداتـە مـامـۆستـا مەعرووف خەزنەدار بەهیوای لەچاپدانی، کـەچی پاش ئەوەی کە هەشت ساڵ لەلای دەمێنێتەوە ناچار بە هەر بـارێك لێی وەردەگـرێتەوە، وە هـۆی ئەو راگیـرکردنـە زۆرەش لای مامۆستا مەعـروف نازانم چی بـووە؟! ئیتر حاڵی ئەم دیوانە بەم جۆرە، لەو کاتەی کە نووسراوە تا ئەمرۆ رووناکایی بەچاوی خۆی نەدیوە هەر ژێـرزەمین نشین بووە.. تا ساڵی (١٩٨٠) لەسەر داواکاری خۆم برای خۆشەویست مامۆستا مجید رؤوف بەتێرادیتەو پێ‌خۆش

بوونەوە هاتە پێش‌و ئەم دیوانە دەستخەتـەی دڵداری برای خستە بەر دەستم، کە شایانی سوپاسی بێ پایانە، بـەراستی منیش لەو ساوە بـە شانـازی‌یەوە کـەوتمـە کـردوکۆش‌و کـۆکردنـەوەی هـەر شتێـک پـەیـوەنـدی بـەشاعیـرەوە هەبێت وە نـامەم بـۆ چەنـد نووسـەرو ئەدیبێکی ئاشناو شارازا بەژیانی دڵدار نووسیوە، بۆ ئەم مەبەستەش چەند جارێك چوومەتە کۆیە، وە بە پەرۆش‌و رشـت بـووم لەســەر زۆرتـرین زانـیـاری دەربـارەی شاعیرەوەم دەستکەوێت. پڕ بە دڵ حەزم دەکرد زوو بە زووش ئەم دیوانـە بخرێتـە بەر چـاپ‌و بڵاوبکـرێتەوە بەڵام:ئەرکی زۆری رۆژانەو باری قورسی ژیانی ئەمڕۆو. نـەبوونی کـارەبای شـەوانی زستان‌و چـاوەنۆڕکـردنی وەڵامی هەندێ نووسەرو ئەدیب کە زەکـاتێکی باشی لە کـات لێ وەرگرتـین، ئەوەش بـۆ سوودو بـەرژەوەنـدی دیوانەکە بووە.. سەرەڕای ئەمانەش لەبەر هەر هۆیەك بـووبـێـت چـوارجـار سـەراپـا ئـەم دیـوانــەم نووسیوەتەوە..ئیتر ئـەمانـەو لەگەڵ هـۆیەکی گـرنگی تریش بوونە بەرهەڵست کە درەنگ ئەم دیوانە بخرێتە ژێر چاپ.



دیوانی شیعری دڵدار بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٦١و دووەم جار لە ساڵی ١٩٧١دا لە چاپخانەی کوردستان لە هەولێر بڵاوکراوەتەوە..

دلدار شیعری بڵاونەکراوەی کەمە هەرچی هەیەتی لە دیوانە چاپکراوەکەیدا هەیە تەنیا دووپارچە شیعر نەبێت؛ یەکەم لە ژێر ناوی «ئادەمیزادو ئەدیان»دووەم بەناوی «موفرەدات» ئەو دوو پارچە شیعرەش لەبەر پەیرەوی باری کۆمەلایەتیو سیاسی ماوەی بڵاوکردنەوەی نەبووە، بەڵام یادداشتو بەرهەمە ئەدەبیەکانی تری جگە لە چەند ووتارێك کە لە گەلاوێژ بڵاوکراوەتەوە ئەگینا هەر بە هەلگیراوەیی ماوەتەوە وا بۆ یەکەم جار کەوتە بەردەستی ئێوەی بەڕێز، با ئەوەش بڵێم کە من زۆر بە ئەمانەت هەر چۆنێك شاعیر بۆخۆی نوسویەتی بێ دەسکاری کردن وام خستە بەر چاو، تەنیا بەپێی پێویست ووشەو ڕستەم گۆڕیوەتە سەر شێوەی ڕێنووسی ئەمڕۆ مەبەستیشم لەوەدا خزمەتی زمانو ئەدەبی کوردی بووە.. وە شیعرەکانیشی بەگوێرەی دیوانە دەست خەتەکەیم نووسیوەتەوە بە پێویستم نەزانی جێ گۆرکێی پێ بکەم. ئیتر تکام وایە لە کەموکوڕیمان ببورن چونکە هەرئەوەندەم لە توانا بووەو بەمەش هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکی ئەدەبی کوردیم کردبێو هەزار سڵاویش بۆ گیانی پاکی بێ گەردی (دلدار)ی شاعیری جوانەمەرگی کوردو کوردستان.

عبدالخالق علاءالدين مصطفى
هەولێر ٢٠/٣/١٩٨٣

## // یادداشت

خۆزیا هەموو شاعیرو نووسەرو ئەدیبێکی ناوداری کورد سەربوردەو مێژووی ژیانی تایبەتی خۆی وەك دڵدار بۆ ئەوەی دوا ڕۆژ نووسیبا بۆ ئەوەی ئاگاداریەکی ڕاستو تەواویان لەبارەی بەسەرهاتو هەستو نەستو ئاواتو ئارەزوویان بووایە.. بەلام بەداخەوە زۆربەیان لەم بارەیەوە کەمتەرخەمیان کردووە، ئەوەش بووەتە هۆی نەك تەنیا ون بوونی زۆر لایەنی ژیانی شاعیر تەنانەت دیار نەبوونی مێژووی ڕاستەقینەی هاتنە دونیاو کۆچی‌دوایشیان، نووسەرو مێژوونووسانیان خستۆتە سەرگەردانیو گەڕان بە شوێن سەرەداوێك کە ئاسۆی زانیاریان کەمێ ڕەوشەن بکاتەوە. ناچار پەنایان بردۆتە بەر ناواخنی شیعرەکانیان یا ئەبێ بگەڕێن بە شوێن ئەوانەی کە هاوتەمەنو هاوچەرخی شاعیر بوون وە لەزاری ئەمو ئەو شتێك ببیەنو پەردە لەسەر هەندێ لایەنی ژیانی شاراوەی شاعیر لادەن.. ئەوەش بەهەر بارێك ئەدی ئەوانەی کە هاوچەرخو هیچ شوێنەوارو زانیاریەکی واشیان دە ربارە نی‌یە ... چۆن...؟!

دەتوانم بلێم دڵدار یەکەم شاعیر بووە کە مێژوو بەسەرهاتی ژیانی لە کۆرپەیی تا پێش کۆچی دوایی بەم شێوە ڕێكو پێکە بۆ نووسیبێن، چ شتێکی شوێن پرسیارو گومانی بۆ نەهێشتوینەتەوە کە ئێمە لێی بدوێین‌(دڵی خۆی بۆوالا کردووینو پەردەی لەسەر ناخی دەروونی پڕ هەستو سۆزو ئاواتی پیرۆزی لاداوە، وەك شریتێکی سینەمایی هەموو لایەنێکی ژیانی تایبەتی خۆی نیشان داوین، جا دووبارە من ئەوە دەلێم کە شاعیرانی پێشومان ئەوەیان بۆ نەکردووین، دەبا لەمەولا لەسەر پەیڕەوی دڵدار ، شاعیرو ئەدیبانی کوردی ئێستامان بۆ نەوەی داهاتوو ئەوە بکەن.

ئیتر با پێکەوە بکەوینە گوێگرتن لە دڵدار.... بەسەرهاتو یادداشتی خۆی بگێڕێتەوە بۆمان. ئیتر ئێوەو یادداشتە مێژوویەکەی دڵدار.

دەقی یادداشتە دەسخەتە تایبەتیەکەی «دڵدار»

## موزەکەراتی یونس ڕەئووف ـ دڵدار ـ

دەم نا دەم ئینسان خۆی لە هەموو ئەو موحیتەی کە تێیدا ئەژی رزگار
.ەکاولەوشتانەی کە لە دەوریایە دوور ئەخاتەوە، تا وای لێ دێت غەیرەز (خۆی)
نەبێ چیتری بەمێشکدا نایێت بە چاوێکی تیژەوە سەیری پاشەڕۆژ دەکات کە
پردەهای ئەقدارنو هێندە لەسەریەکو زۆرن کە نەک بەچاوی ئیعتیادی تا

بەچاوی ئەندیشەش ناتوانری ئەمەی کە لەودیوی شارراییتەوە ئەوساکە هەروەك هەوریکی نەزانین دلی ئینسان داگیر دەکا تروسکەییکی دووری ئومێدیشی ژیان لە مێشکی ئەو کەسە ئەچەسپێنێ جا بەتێنیو بێ تێنی ئەم تروسکەیە بە دلی ئەو کەسەو ئامانجەکانیو حالەتی ژینییەوە بەستراوە هەروەکو ئینسان سەیری دووا رۆژی دەکا، بەچاوێکی پڕ حەنانەوە سەیری رابردوشی دەکا بێشك سەفەحاتی ژیانی یەك هەل ئەداتەوە. هەرچییەکی کە زاکیرە بە خەتێکی ئاشکار بۆی نووسیبی ئەخوێنێتەوە وە حەوادیسی رابوردووی دێتەوە یاد، ئایا ژیان بێجگە لە زنجیرە حەوادیسێك زیاتر چیترتان بە مێشك دادێ کە تەعریفی پێ بکەن؟ باوەڕ ناکەم..

لە سالی «١٩٣٨» وەکو ئیمڕۆکە دەستم دایە قەلەم کە بە موناسەبەتی عومری بیست سالەم موزەکەراتم تەسجیل بکەم چوار لاپەڕەم رەش کردەوە، بەلام مەوسیمی کۆششو خۆ بۆ ئیمتحان ئامادەکردن بوو بە نیوە چڵو بەجێم هێشت. کەچی لەدوواجارا ئەودەفنەرەی کە موزەکەراتم تێدا نووسیبۆوە گەلێ شتی بەقیمەتی تێدا بوو لێم ون بوو نازانم کە کام دەست ئەم خەزێنە بەنرخەی لەدەست دام؟

وا ئەم جارەش بە موناسەبەتی ئەوەی کە لە مونتەهای کولیەی حقوقمو ئەمە ئاخیر سالە کە خۆم بە قوتابی دائەنێم، پاش مانگێکی تر ئەم لەقەبە پیرۆزەی کە سالەها پێمەوە نووسابوو ئەویش «قوتابی» لەسەرم لائەچێ. دەستم کرد بە نووسینەوەی موزەکەراتم، هەموو ئومێدم وایە کە چ حەلقەی زنجیرەی رابردووم لێ ون نەبووبێ لەگەل ئەمەش ناحیەیێکی زۆر مهیم لە ژیانا لا نیە کە ئەویش تەئریخی ئەو رۆژانە نازانم کە حەوادیسی لێ قەوماوە چونکە لەوەختی خۆی ئەم تەئریخانەم لای خۆم تەسجیل نەکردووە، بەلام لەوە ئەمێنم کە ئەتوانم وەکو شەخسێکی ئەجنەبی سەیری یونس رەئووف بکەمو زۆر بە ئەمینی موزەکەراتی بنووسمەوە مرازیشم لەمە ئەمەیە کە رێگەی عاتیفە نەدەم کە یاری بەقەلم بکاتو شتێکی نەقەوماو بخەمە رێزی قەوماوەوە، وە شتێکی قەوماو بخەمە پایەی نەقەوماوەوە، دیسان زۆر هەولی ئەوە ئەدەم کە بە تەرتیب ئەم موزەکەراتە تەسجیل بکەم تا بتوانم عیللەتی گەلێ شتی پێ تەفسیر بکەم جا نازانم لەمە موەفەق ئەبم یانا ئەمەش عائید بە خوێندەوارانە.

## - له دایك بوونم -

من ناوم یونس ڕەئووف کوڕی مەحموود کوڕی مەلا سەعدم له بنەماڵەی «خادم السجادەین»[1] له ڕۆژی (٢٠)ی شوباتی ساڵی (١٩١٨) له کۆیه لەدایك بووم، دایکم ناوی (زەهوە) کچی خورشید ئەفەندی‌یه، فامیلیای[2] دایکم عەلەم زادەن‌و له زەهاوەوە هاتونەته قەراغ زێی کۆیه وە ئیسکانیان کردووە، تا حاجی قادری کۆیی مەشهوور لەم فامیلیایەیه، ئێستاش ئەم تیرەی که له (کانی لەله، سێ گردکان، سێ کانی، ئۆمەرگومبەت) دائەنیشن به (دەربەندی) ئەناسرێن به زوبانێك[3] قسه دەکەن که نزیکی (باجەلانی)یه گەڵێ خزم‌و ئامۆزای له کانی لەله هەیه که دێنه کۆیه دایکم زۆر به چاوێکی بەسۆزەوە سەیریان دەکاو خۆی پێیانەوە هەڵئەشەنگێنێ، باوکی دایکم خورشید ئەفەندی هەر به مەئموریەت مەشغول بووە وا ئەڵێن که کاتبێکی چاك‌و پیاوێکی عاقڵ بووە، دایکم ئافرەتێکی دڵ نەرمی جارجار زۆر توڕەی، سەخی، به تەدبیرەیە، بێجگه لەمەش زۆر موتەحەمیلەیه، وە عیزەتی نەفسێکی زۆر نادری هەیە. ئەڵێم من له ٢٠ی شوباتی ساڵی ١٩١٨ لەدایك بووم، وەختی لەدایك بوونم تەسادوفی نیهایەتی گرانی‌و له بەهارا بووە دونیا زۆر بەترس، خەلقی زۆر برسی‌و پەرێشان بوو، تا ئێمه که بەشی خواردنی خۆمان دەغڵمان هەبووە، لەو ڕۆژانەدا عەسکەری عوسمانی شوێنی (چاڵەکانی) پێی زانیوه هاتوون هەموو دەغلەکەمانیان بەتاڵان

---

(٢) دڵدار به درێژی باسی ئەو بەرماڵەی پێغمبەر دەکات که چۆن کەوتۆتە دەست بنەماڵەکەیان‌و بەهۆی ئەوەوە نازناوی (خادم السجادە)یان وەرگرتووە - بەپێویست تەزاندرالەم دیوانەدا باس بکرێت .

(٣) فامیلیا خێزان ، بنەماڵە ، خانەوادە . (نووسەر) :

بردووه ذاتەن لە دوا رۆژانی حکومەتی عوسمانی باوکم لەگەڵ قایمەقامی کۆیە لەسەر مەسئەلەیێک تێک چووبوو. لەسەر ئیشارەتی قایمەقام بە ناوی مەئموریەتی نفووس لە کۆیە نەهێشترابوو، لە رانیە بووە، برای هەرە گەورەم سەعدی ئەگێڕێتەوە: ئەلێ ـ لەو رۆژەی کە لەدایك بوویت خەبەرمان بۆ هات کە دەغلەکەمان حکوومەت بردیو هیچمان نەما باوکیشم لە کۆیە نەبوو مەجبور ماین کە ئەشیای ناوماڵ بفرۆشین دەغلی پێ بکڕین و خێزان ئیدارە بکەین تا خەرمانی تازە بەرکوت ئەبێ، پاش شەش مانگ ماڵی ئێمە چووتە رانیە لە وێندەر (نەوعەنما) خۆمان گرتەوە

لە دوا جارا عوسمانی شکاوەو وولاتی ئێمە بە هودنە ئیحتیلال کرا، مەئمورینی ئەوێ قبوڵی حوکمی ئینگلیزی کرد، مایەوە ئەوەی قبوڵی نەکرد پەراگەندە بوو، ئێمە یەك لەو پەراگەندانە بووین باوکم بە تەنها فیراری کردبوو لە رانیە نەمابوو ماڵی ئێمە بە حیمایەتی فەتاح بەگ ـ لەدوا جارا بە دەستی ئینگلیزەکان کوژرا، ـ لە رانیە مابۆوە لە پاشان بە شەوێکی زۆر ناخۆش بەدزی بارمان کردووە هاتووەتەوە کۆیە من ئەوساکە عومرم ساڵە وەختی بووە، باوکم وای چووبووە عەقڵەوە کە مادامەکی حکوومەتی ئیحتیلال متەوەقیفی سەر (ئیستفتایە) هەر حکومەتی عوسمانی دێتەوە ویلایەتی موسل، هەر بەو ئیعتقادەش بووە کە وەزیفەی لە حکومەتی ئیحتیلال قەبوول نەکرد، بەلام لەلایەکی تریشەوە حیسی ئەمەی ئەکرد کە ئەگەر لە کۆیە بێ تووشی زەرەر ئەبێ لەبەر ئەمە لە پێش گەڕانەوەی ماڵی ئێمە بۆ کۆیە ئەو چوو بووە هەولێر لای مەلا ئەفەندی، مەلا ئەفەندیش گوندێکی کە ناوی (بێستانە) بوو دایێ کە زراعەتی لێ بکات و بحەوێتەوە. ماڵی ئێمە هێندە لە کۆیە گیر نەبوو بوو کە باری کردبوو بۆ بێستانە من خۆم بێستانەم بەفکر نایێت وە نازانم چۆن بووە بەلام لەسەر ئەوەی کە ئافرەتێکی هەڵگیراو ئیلتیجای بە ماڵی ئێمە کردبوو پیاوانی شێخ مارف (هەلەجە) ویستبویان کە بیکوژن و ئێمەش مودافەعەمان کردبوو پیاوەکانمان دەسگیر کردبوو لەمە شێخ مارف کە خەزووری ئەحمەد ئەفەندی (موتەسەریف) بوو عاجز ببوو وە ئەحمەد ئەفەندی ئامۆزای مەلا ئەفەندی بوو بەو موناسەبەتە مەلا ئەفەندی دڵگیرو بێستانەی لە ئێمە ساندبۆوە، باوکم خودا عەفوی کا پیاوێکی زۆر خزم پەروەر بوو زوو تووڕە ئەبوو و زووش ئاشت ئەبۆوە، بەمە

ئیقناعی کردبوو که بێته هەولێر دابنیشێ. لەو تەئریخەشدا خالم عەبدوللا ئەفەندیو جەماعەتێك دوو زابتی ئینگلیزیان له هەولێر کوشت بوو، خالۆم ئیعدام کرابوو ئەم مەسئەلەیه زیاتر باوکمی هاوێشتبووە سەر ئەمە که زیاتر ئیحتیما به مەلا ئەفەندی بکات چونکه ئیعتیقادی ئینگلیزەکان وابوو که عەبدولا ئەفەندی خالم لەلایەن عوسمانی پەروەرەکانەوە تەحریز کراوەو باوکیشم زاتەن یەك لەو عوسمانی پەروەرانه بوو.. مالی ئێمه هاته هەولێر بەلام له نیهایەتی پەرێشانیو رووتی..هەر چەندی دەکەم هەر خۆم له هەولێر دێتەوە یاد، وام دێته بەرچاو که له خانوویەکی حەوشه زۆر بەرین، له دەرگای حەوشەکە ئەهاتیه ژوورەوە لای دەسته راستت مەتبەخەکی تاریکی دیوار رەشو له تەنیشتی راستی مەتبەخەکە کەلاوەی دوو هۆدەی رووخاوت ئەدیت لای دەستە چەپت هەیوانێکی بلندو کەلەگێکت چاو پێ ئەکەوت، دوو هۆدەی درێژو بەرین لەوبەرو ئەم بەری کەلەگیکەدا بوو دەرگایان دوو دەری لەسەر کەلەگیو پەنجەرەشیا لەسەر هەیوانەکەدا بوو، لای راستی هەیوانەکه قادرمەیەکی درێژ هەبوو که بۆسەربان ئەچوو هەروها قادرمەی ئەم پەیژەیه خلیسك بوو، لەبن قادرمەکه تاقێك کرابوو که جێگای کوپ بوو مەتبەخ و هەیوانەکه روو له یەکتر ئەم بەرو ئەوبەرکەوتبوون له ناوەندی حەوشه بەرینەکەدا کۆسپەیەکی چوار سووچی گەورە هەبوو که پایزانو مال لەحەوشان لەسەری ئەنوستین، خۆم لەیادە که پاوانەم له پا بووەو کۆچکم لەسەر بووە پێش چاوەکەی کۆچکم پلپلەی زیو بوو تازه بەسەر پا ئەکەوتم ئەرۆیشتمو بەرئەبوومەوە، مندالێکی هەراشی ئەسمەری دەمو چاو خرۆکاوی دەستی ئەگرتمو راستی ئەکردمەوەو گۆرانی بۆ ئەوتمو ئەیرواندم. دیواری خانوەکەم هەر لەبەر چاوە که کۆنو کەلو کۆم بوو. بانەکەمان بەرینو ستارەدار بوو ئەمه یەکەم لاپەرەی یادمه که بۆتانم بەیان کرد. جارێکیان ئەم وەسفەم بۆ دایکم کرد ووتی رۆله فکرت زۆر تیژه..ئەمانەت چۆن لەبیر ماوە؟!! له لەیێکی ئافرەتم هەبوو که ناوی (فاتمی سیدی) بوو من بانگم ئەکرد (واوەی سیدی) زۆرم خۆش دەویست تا ئێستاکەش که ئەچمه مالی خوشکم له هەولێر فاتمی سیدی ئەبینم حەنانی مندالیم بۆی ئەبزوێو حەز ئەکەم که خۆمی فرێ دەمەوە باوەشی لەگەل ملوانکه زەردو سورەکانی یاری بکەم بەلام هەیهات نه من وا بچووك مامەوە که له باوەشی ئەو جێم بێتەوەنه ئەو ملوانکەی زەردو سووری ... چونکه زۆر پیر بووە وا پای لەسەر لێوی قەبرە، تاکو ئێستا ئەم چەند

ووشه‌یه ئه‌نووسمه‌وه ده‌نگی غه‌ریبی واوه سیدم له گوێدا ئه‌زرنگێته‌وه كه چۆنی ئه‌نواندم‌و ده‌ستی له پشتی ئه‌دام یا سه‌ری ئه‌خوراندم ئه‌ی ووت«پسكۆ.. بنووه چ گورگ له مال نی‌یه ده‌نگی بلوێری شا دێت!!» حه‌قیقه‌ته‌ن ئه‌م ده‌نگه بۆ من ده‌نگی ئه‌و بلوێره خۆشه‌یه كه هه‌ر له‌رینه‌وه‌ی حه‌له‌قه‌یێكی عومری رۆیشتوومه. به‌راستی ده‌نگێكی دلارام‌و ئاسووده بوو وام له دایكم بیستووه كه من زمانم پشكوت‌و به سه‌رپا كه‌وتم زۆر فه‌سیح‌و قسه‌زان بووم به‌لام له عومری

چوار سالیمدا به نه‌خۆشێكی زۆر گران كه‌وتم سالێك ئه‌م نه‌خۆشیه‌م ته‌فسیلی كێشاوه‌ته‌وه كه چاك بوومه‌وه لال بووم له دواجارا كه زوبانم كراوه‌ته‌وه به‌و (لاله پەته‌یی) قسه‌م كردووه، ئێستاكه‌ش ئه‌م زوبان گرانه‌م هه‌رماوه وه له گه‌لێك مه‌زایای ژیان بێبه‌ری كردووم، من ئه‌م نه‌خۆشیه‌م هه‌موو له‌یاد نه‌ماوه‌ته‌وه هه‌ر هێنده‌م له‌بیره كه «فاتمی سیدی» له باوه‌شی ئه‌كردم چارۆگه‌یه‌كی سپی به‌سه‌ر دائه‌دام پێی ئه‌ووتم: بچین بۆ بازار.. چیكولانه‌ت[٥] بۆ بكرم. له قه‌لاتی هه‌ولێر ئه‌یهێنامه خواره‌وه، به‌لای ده‌سته راستا به رێگه‌یێكی باریكی درێژی خۆله‌پۆتی‌دا ئه‌بردم تا ئه‌گه‌یشتینه خانوێكی زۆر گه‌وره‌ی دیوار سپی، خه‌لقێكی زۆری تێدا كۆببووه‌وه بۆنێكی ناخۆشی لێوه ئه‌هات ئه‌مزانی كه ئه‌وێ «خه‌سته‌خانه‌یه» ئه‌گریام‌و ئه‌مووت «ناخۆمه‌وه...ناخۆمه‌وه...» هێنده‌ی پێ نه ئه‌چوو كه پیاوێكی سوورو‌سپی قه‌له‌و ده‌هات ناوی (ئالتون ئه‌فه‌ندی) بوو له باوه‌شی فاتمه سیدی وه‌رئه‌گرتم، له ژوورێكی به‌ریندا له‌سه‌ر مێزێكی سپی درێژی ئه‌كردم لووتی ئه‌گرتم ئاوێكی سپی زۆر ناخۆشی به گه‌رودا ئه‌كردم، لێم نه‌ئه‌گه‌را تا قووتم نه‌دابایه ئینجا ئه‌یدامه‌وه سیدی فاتمه، سیدیش به ماچكردن‌و لاواندنه‌وه ئه‌یبردمه‌وه ماله‌وه له ناو جۆلانه‌یه‌كی بادا درێژیان ئه‌كردم‌و رایان ده‌ژاندم، هه‌روه‌كو عه‌رزم كردن كه بۆ من ته‌سادوفی ده‌وری فه‌قیری‌و ده‌ربه‌ده‌ری فامیلیای ئێمه‌ی كردووه هه‌ر له‌و فه‌قیریه‌ش گه‌وره بووم، خێزانێكی زۆری وه‌ك مالی ئێمه له هه‌ولێر به كلاودروه‌تی‌و موساعه‌ده‌ی مه‌لا ئه‌فه‌ندی به‌رێوه ده‌چوو. له‌گه‌ل ئه‌مه‌شدا عیزه‌تی نه‌فسی عائیله‌وی‌و خۆبه‌كه‌م دانه‌نانمان هه‌ر موحافه‌زه كردووه، قه‌ناعه‌ت‌و رازی بوون شیعاری ژیانمان بووه. من له‌سه‌ر ئه‌م قه‌ناعه‌ته په‌روه‌رده كراوم، له‌جیاتی شیرینی ژیان تالاوی فه‌قیریم چه‌شتووه تا فاتمه‌ی سیدی له‌له‌م به ده‌ره‌جه‌یێك ئیهتمامی به‌م ناحیه‌یه‌م داوه ئیمرۆكه چ

(٥) چیكۆلانه : چوكلات .

مورەبیەکی (موسەقەفە) ناتوانێ کە منداڵ وا لەسەر خوێیێکی باش‌و چاوتێری پەروەردە بکات، تەسەورکەن کە جارجار ئەچووینە قەسری مەلا ئەفەندی لەوێندەر حەلەویات‌و شەکریان بۆ ئەهێنام ئەك وەری بگرم بەڵکو تەماشاشم نەدەکردن لەبەروەی نا کە گۆیا نەمزانیبێ ئەمانە خۆشن‌و من لێی مەحرووم وەیا حەزم لێ نەبووبێ، بەڵکو وام چووبووە مێشکەوە کە لە ماڵی خەلق تەماشای شتی خەلق کردن خراپە، ئەگەر بێت‌و وا بکەم فاتمە سیدیم لێ عێجز دەبێ..

جارێکیتر حیکایەتی «مەڕۆکەو بزنۆکەم» بۆ ناکا. ئێستاش لەسەر عەینی خوو ماوم یەعنی ئەتوانم زۆر بە سەهلی لەگەڵ زروفی ژیانی خۆم، خۆم ڕێك بخەم، هێشتاکە بە فیکرم دانایێت بەتایبەتی حەزم چووبێتە چ نەوعە خواردنێك ئیستنکافم کردبێ.. دایکم نەیهێشتووە کە بچمە «کۆڵان» لەگەڵ منداڵان یاری بکەم بۆ ئەوەی کە لە ماڵەوە عاجز نەبم دایکم ئافرەتێکی بەخێو دەکرد دوو کوڕی پارچەلەی هەبوو یەکیان ناوی «خدر» ئەویتریان ناوی «عزیز» بوو، ئەم دوو کوڕە لە حەوشەدا یاریان لەگەڵدا دەکردم ئەغلەب یاریمان عیبارەت بوو لە تەمسیلی ئاغاونۆکەر منیان ئەکردە (ئاغا) خۆشیان ئەبوونە (نۆکەر) خزمەتکار ئیتر ئەمرم دەکرد ئەوانیش بەقسەیان دەکردم بەمە تەحەکومێکی زاتیم لەگەڵ خوێندا تێکەڵ بووە یەك لە خەسائیسی ئەسڵیم کە چەندی ئەکەم ناتوانم بێ ئەو تەحەکومە بژیم. برایەکی لەخۆ گەورەترم هەبوو ناوی (جەواد) بوو ئەم برایەم هاتووچۆی مەکتەبی دەکرد. دەفتەرو قەڵەم‌و کتێبی پڕ لەوێنەکانی لەسندووقێکی بچووك دانابوو لە جێیێکی بلندی دانابووزۆرم حەز دەکرد منیش وەکو ئەو سندوقێکی بچووکم هەبێ کتێبی پڕ لە ڕەسمم بێ وەکو ئەو بە قەڵەم‌و مەرەکەب بنووسم نەیێلم کەسم نێزیك ببێتەوە، بەڵام ئەو برایەم لە ساڵی ۱۹۲٦ لەگەڵ باوکما چووبوو بۆ کۆیە وە لەوێ لە مەکتەبی ئەخوێند بە نەخۆشێیکی (موفاجیئ) وەفاتی کرد لە دوای ئەم حادیسەی وەفاتە بەساڵێك من چوومە مەکتەبەوە، با جارێك ئیستیعجال لە چوونی مەکتەب نەکەم باشە، چونکە ئەویش لە زروفێکی خاسدا بووە.. با هەندێك لە تەحلیلی نەفسیەتی خۆم بدوێم باشە، چونکە هەر خاسیەتەی کە لەخۆمدا ئەبینم سەبەبێك‌و مونەسیرێکی هەیە.

عەرزم کردن کە خاسیەتی خۆ زەبت کردن‌و تەحەکومم لە چ وەرگرتووە ئێستاش ئەمەوێ کە زیاتر لەبابەتی تری نەفسی خۆم بدوێم. بەلام زروفی ئەوساکەی عائیلەوی مامۆستای هەرە گەورەم بووەو سولتەی دایکم‌و خوشکی

لەخۆ گەورەترم مورشیدم بوون. عەرزم کردن کە لە هەولێر زۆر بەفەقیریمان رابوارد حەقیقەتەن گەر کلاودرون نەبوایە بە هیلاك ئەچووین لەگەڵ ئەوەشا نابێ ئینکاری فەزلی موساعەدەی مەلا ئەفەندی[6] بکەم، ئەمما دایکم ئافرەتێکی دیدە بوو خاوەنی عیزەتی نەفسێکی زۆر بەرز بوو، هەرگیز مالی ئێمەی لە خزمەتکارو خزمەتچی ئافرەت خالی نەکردووە لەبەر ئەوە من کە منداڵێك بووم خۆم لەناو مەزاهیری زادەگانیدا دیتووە،ئەما لەبەر ئەوەی کە دایکم ئەوساکە تازە برای ئیعدام کرابوو لەپاشان لە وەختێکی زۆر دەست کورتو فەقیری بوو هەردەم چاو لەگریانو لە رووخۆشی دوور بوو منیش لەناو موحیتێکی غەمو ئەندۆ پەروەردە دەکرام شێوەیێکی (کەئابەت)و ماتییێکی تەبیعیم وەرگرت، کە دایکم ئەگریا زۆری پێ تێك ئەچووم، خێرا فاتمە سیدی وە یەك لە خوشکەکانم منیان ئەبردە لاییێکی ترەوە ئەیان غافلاندم حیکایەتی خۆش خۆشیان بۆ ئەکردم، لەلاییێکی دامانو غەمی دایکم وە لەلاییکی کەش حیکایەتەکانی.. ئەم حیکایەتانەی کە بۆم ئەکرا ئەیان هاوێشتمە ناو شەپۆلی خەیالاتێکی ئاسوودە، تا وام لێ ئەهات زۆر جاران بە تەنها لەگەل خۆم ئەدوام بەمە لێم ئەترسان کەنەك شێت بم ئێستا لەگەلخۆ دوانم نەماوە، هەرچەندی وەخت بەخەیال کردنەوە رابوێرم لام کەمە.

لەبەر ئەوەی کە لە هەولێر بە کرێ لەخانوو دائەنیشتین جارجار خانوو گۆرکێمان ئەکرد لە خانیەکەی کە باسم بۆکردن هاتینە دەرەوە چوینە خانوێك کە ئەویش حەوشەیێکی زەلامی هەبوو، دالانێکی درێژو لەلای دەستی چەپی حەوشەکە گومبەتێکی روخاو کە مەرقەدێکی[7] (حەبیبی نەجار) ئافرەتە هەولێری ئەهاتن زیارەتیان ئەکرد مومیان لەسەر مەرقەدەکە پێ ئەکرد. لەدوا جارا باوکم رۆیی بۆکۆیە ئێستا ئەزانم کە بە واسیتەی مەلا ئەفەندی وەزیفەی کاتبەتی نفوسیان لە حکومەت بۆپچراند بوو لەپاش باوکم جەوادی براشم چووبۆ ئەوێ ئێمەش لە خانوی (حەبیبی نەجار) هاتینە دەرەوە چووینە خانوێك کە زۆر گەورە بوو، بەلام هەمووی عائید بە ئێمە نەبوو بەلکو هەر هۆدەو هەیوانێك کە سەرکۆشك بوو عائید بە ئێمە بوو پێیان ئەوت خانوی (حاجی مەعرفی خەفاف) کە لە خانی حاجی مەعرف بووین دراوسێیکمان هەبوو ناوی (ئامینە خانم) بوو ژنێکی لاوازی زۆر بە ویقار بوو زۆرم شەرم لێ ئەکرد ئەویش زۆری خۆش

(٧) مەرقەد ـ گۆر ـ قەبر .

دەویستم کوڕیکی هەبوو ناوی(ئەمین) بوو زور پاك‌و خـاوین‌و بە ئـەدەب بوو هەموو رۆژێك ئەچووە مەکتەب هەموو رۆژێك بە پێش پەنجەرەی مالی ئێمەدا رائەبورد گەلێکم حەسوودی پێ ئەبرد چونکە ئەچووە مەکتەب،

جارجار بە دایکم ئەوت (ئەمنیش ئەچمە مەکتەب) ئەیـووت:(با بـاوکت بێتەوە دەتنێرم بۆ مەکتەب) هەر چاوەڕێی باوکم بووم کە بێتەوە، بەلام بێ فائیدە بوو تا پاشی شین‌و واوەیلایەکی زۆر دایکم قەراری‌دا کە ئەبێ بچین بۆ کۆیە، هاوین بوو کە کاروانیان بۆ گرتین «حەویزەی شەمامێ» کە پیاوی مامم بوو ئێمەی بردە کۆیە هەروەك عەرزم کردن سالی ١٩٢٦ بوو کـە جەوادی بـرام وەفاتی کردبوو وە هەر لە عەینی سالیشا بوو کە چووینە کۆیە دەم‌و چاوی تازە تـازە ئەهاتن ماچیان دەکـردم دایکم پێی ئەووتم ئـەمە پـورتە ـ سیم العـزاری ـ خوشکی مامم بوو یان ئەمە مامۆژنتە یان ئەمە ئامۆزاتە یان ئەمە «خاتوونە» بە دەست خۆم نەبوو زۆر زوو ئولفەتێکم پێیانـەوە گرت زۆرم خـۆش دەویستن، خاسەتەن مامم جەمیل ئەفەندی زۆرم شەرم لێ دەکرد، بەلام ئێمە کە زۆر فەقیر بووین مامم نەیهێشت کە بچینەوە خانوی خۆمان بەلکو لە نزیك مزگەوتی «پەلکێ» خانوێکی دوو دەری بن دەرگاییکی گەورەی هەبوو حەوشێکی پان‌و هەیوانێکی بلند دوو هۆدە بەریز یەکەوە لەناو هەیوانەکە هەبوو بیرێك لەناوەندی حەوشەکە هەبوو کە بە ستل ئاومان لێ‌هەل ئەینجا لەوێندەر دائەنیشتین، ئەم خانوە باوکم بەکرێی گرتبوو عائیشەی خزمەتچی کە لە هەولێرەوە لەگەلی هاتبووە کـۆیە ئیشغالی کردبوو، باوکم لە کۆیە نەبوو بەلکو بە مودیری تەحریرات تەعین کرابوو بۆ رانیە چووبووە رانیە لە پاش وەی من لە کۆیە لەگەل مەحمودی ئامۆزام چاوم کـراوە وەکو مـوراقەبـەی دایکم‌و چاوی فـاتمە سیـدیم لەسەر هـەلگیرابـوو کەوتبوومە ژێر حیمایەتی زۆر سارمی مامم (جەمیل ئەفەندی).

مەحمودی ئامۆزام لە مەکتەب بوو وەبۆی ئەگێرامەوە کە مەکتەب چەند خۆشە چۆن یاری ئەکەن‌و تەعلیم دەکەن ـریازەـ بەراستی زۆر شەوقم چووە سەر خوێندن، کە مەکتەب کرایەوە دەستم کرد بە گـریان کـە لازمە بچم بـۆ مەکتەب دایکم دەستی گرتم بردمی بۆ مالی (عەبدولخالق قوتب) کە ئێستاکـە مولاحیزی ئینحیسارە لە شاری کەرکوك ئەوساکـە موعـەلیم بوو لە کـۆیە وە موناسەبەتی خزمایەتێکی عائیلەیمان لە بەینـدا بوو پێی ووت (ئـەمە یـونس

ئەگری بۆ مەکتەب) من بەتەمای ئەوەی کە تۆ ئاگات لێی دەبێ ئەینێرم، ها ئەمە خۆت و یونس ئەگەر بێ ئەمری کرد گوێیەکانی هەڵقەنە عەبدولخالیقە ئەفەندی ووتی: نا.. دایە بە دایکمی ئەووت دایە چونکە شیری ئەوی خواردبوو یونس کورێکی ئاقڵە ئەمە ئەگەر بێت و شتێ بکات من ئەزانم چۆنی عاقل دەکەم «رووی لە من کرد ووتی»: لە مەکتەب شەر ناکەیت؟ ووتم.. نەء.. ووتی هەڵنایەیت؟ ووتم نەء.. بەچاوێکی زۆر بەسام سەیری کردم و ووتی:«باشە.. راوەستە.. تا پێکەوە بچینە مەکتەب لە سالی ١٩٢٧ لە عومری ٩ سالاندا بووم کە لە دوای عەبدولخالق ئەفەندی دەرۆیشتم وە لە حەوشەی مەکتەب دەستی گرتم بردمیە لای مودیر ناوی (عبالرحمن ئەفەندی) بوو بە تەلەبەیی قەیدی کردم لەپاشان بردمیە ژوورێکەوە کە لەسەر تەختەی درێژ درێژیان لەبەر کۆمەڵە منداڵێك دانیشتبوون زۆرترینیان لەمن گەورەترو لەمن بچوکتریشیان تێدا بوو موعەلیمێکی باریکەلەی سپی موو رەش چاویلکەیێکی سپی لەچاو بوو خەیزەرانێکی کورتی بە دەستەوە بوو لەبەر دەمی مێزە درێژەکانی یەك لەدوای یەك راوەستا بوو، منداڵەکانیش بە ووسکتی و (ئینتیباهێکەوە) سەیریان دەکرد، (عبدالخالق ئەفەندی)[8] منی تەسلیمی ئەو کرد بێجگە لە دەم و چاوێك ئەتبێ کە ئەویش دەم و چاوی مەحمودی ئامۆزام بوو، ئەو دەم و چاوانەی کە لە سنف دابوون هەموویانم لا غەریب بوو ئەوانیش بە چاوێکی فزولیانە سەیری ئەم قوتابیە تازەیان دەکرد کە پارچە عەلی‌خانی‌یەکی لەسەری و سەرکەوایێکی مۆرو کەوایەکی «یابانی» زەرد لەبەر جانتایەکی پەڕۆی شین لەمل و سوورەی موو زەردیان دەکرد..

دەرسی ئەوەلم کە وەرگرتووە لەو موعەلیمە باریکەلەیە بوو ناوی (عومەر ئەفەندی) بوو دەرسەکە دەرسی ئەلف‌وبا بوو بە رووییکی بەپێکەنینەوە، بەدەنگێکی لەسەرەخۆی بەتینەوە فێری حەرف (ئەلف)ی کردین وە لەدوای ئەوە فێری حەرف (ب)یشی کردین ئینجا لەسەر تەختە رەشەکەی کە بەرامبەرمان بوو یەك یەك هەلیستاندین و فێری نووسینیشی کردین، ئینجا خۆی چەند کەلیمەییکی لەم دوو حەرفە بۆ تەشکیل کردین بۆی نووسینەوەو بە ئێمەی ووت کە لە دەفتەرەکانماندا بینووسینەوە، عومەر ئەفەندی بەسەرماندا ئەگەڕا فێری قەلەم گرتن و دەفتەر دانان و وەزعیەتی نووسین وەرگرتنی ئەکردین، زۆرم کەیف بەخۆم

هات که له مه‌کته‌ب دانرام‌و له‌ناوپاش ده‌ڵێن «مه‌کته‌بلی‌یه».. ئه‌و ده‌رسه ته‌واو بوو، فیت فیته‌بیکیان لێدا، معه‌لیم چووه ده‌ره‌وه، منداڵه‌کان له هه‌للایان‌دا هه‌ر که‌سه له‌جێی خۆی راستبۆه‌و چوونه ده‌ره‌وه شه‌ش حه‌فتێکیان ده‌وره‌یان گرتم پێیان ده‌ووتم ناوت چی‌یه..؟ کوێنده‌ریت؟ ئیسلامی یان جوله‌که‌یت؟ به‌ڵام مه‌حموودی ئامۆزام زوو به فریام که‌یشت پێی گوتن «ئه‌مه یونسی ئامۆزامه» ئینجا وازیان له ته‌شقه‌له هێنا، هه‌ندێکیان بوونه براده‌رم. به‌م جۆره له مه‌کته‌بی کۆیه دانرام‌و له‌و مه‌کته‌به پیرۆزه‌ش مامه‌وه تا زستان به‌سه‌رچوو به‌هار داهات من له‌و موده‌ته فێری گه‌لێ شت ببووم. به‌ڵام رۆژێکیان دایکم تاریك‌و رۆنی به‌یانی له خه‌وی هه‌ڵساندم که چاوم هه‌ڵهێنا دوو ئێستر راوه‌ستا بوو بارگه‌یان لێ ئه‌نا، دایکیشم قۆندره‌و گۆریه‌ی له پێی مه‌جیدی برام ده‌کرد چونکه له من بچووکتر بوو، ئه‌وها من‌و دایکم‌و مه‌جیدی برام‌و حه‌ویزه‌ی پیاوی مامم به‌رێ که‌وتین، فاتمی خوشکم له مالی مامم به‌جێما، ئێمه چووینه رانیه. پاش نیوه‌رۆیکی دره‌نگ بوو که گه‌یشتینه رانیه، دونیا به‌هار ده‌شت‌و کێو ره‌نگاوره‌نگ سه‌رما هێشتا به‌ته‌واوی نه‌شکابوو کۆیه نیسبه‌ت به هه‌ولێره‌وه وه‌ك گوند وابوو که گه‌یشتمه رانیه کۆیم وه‌کو شارێکی زۆر قه‌وغام ئه‌هاته به‌ر چاو، دوور به دووری رانیه شارێکی گه‌وره بوو به‌ڵام له نزدیکه‌وه ئه‌م دیوارانه‌ی که ئه‌که‌وته به‌ر چاوت زۆر که‌میان سوانده‌دارو سه‌ربان له‌سه‌ر بوون چونکه هه‌مووی که‌لاوه بوو رانیه له پاش حه‌ره‌کاتی ده‌ربه‌ند ئینگلیزه‌کان به بۆمبا وێرانیان کردبوو تازه به تازه ته‌شکیلاتیان تێدا ده‌کرد، زۆرترینی ئه‌هالی رانیه عیباره‌ت بوون له ماله پۆلیس‌و شه‌بانه‌و مه‌ئمورینی حکومه‌ت، خه‌لقی دێهاتی ئه‌و ده‌وره‌ش تاك‌و توك بۆ خزمه‌تکاری‌و ره‌نجبه‌ری به‌ماله‌وه روویان تێکردبوو (والحاصل) رانیه یه‌ك له‌و شوێنانه بوو که حه‌رب سه‌رو گوێلاکی شکاندبوو له‌پاش دل له‌خۆبوونه‌وه‌یکی زۆر به‌خۆ هاتبۆوه به‌ڵام هێشتا برینه‌کانی چاك نه‌بوبۆوه هه‌ر ده‌رمان ده‌کرا. له هه‌موو لایێکه‌وه (خشت) ئه‌برا بناغه لێ ئه‌درا، دیوار ئه‌کرا. رانیه ئاوه‌دان ئه‌کرایه‌وه ژیانی رانیه‌م زۆر لا خۆش بوو چونکه ژیانێکی دێهاتیانه بوو هه‌تا چاو ئه‌رۆیی هه‌ر حه‌وشه‌ی مالی خۆتان بوو هه‌وایێکی پاك‌و ژیانێکی پر نیشاتم هه‌بوو وه‌نه‌بوو که جێبه‌جێ که گه‌یشتمه رانیه ده‌وامی مه‌کته‌بم تێدا کردبێ به‌ڵکو له به‌هاره‌وه تا پایز من ته‌رکی مه‌کته‌بم کرد، ئه‌ویش له‌به‌ر ئه‌مه‌بوو که هه‌ر ده یان دوانزه رۆژ من له رانیه ساغ مامه‌وه، له دواجارا (فوجئه‌ته‌ن ـ فجأة ـ) تووشی

نەخۆشی (مەلاریا) هاتم ئیتر مەلاریا سەری تێ‌کردم رۆژێک چاک‌و چوار رۆژ نەخۆش بووم لەگەل ئەمەش رانیەم هەر لاخۆش بوو خاسەتەن زۆر مەفتونی (قولە) بووم، قولە ئەم کانیە بەرینەی ئاو رۆنەی بەفراوە هەموو مەشاعیری لێ زەوت کردبووم هەر کە چاک ئەبوومەوە خێرا ئەچوومە سەر قولە لەناو رووبارەکەی مەلەم دەکرد لەبن داربیەکانی راوە چویلەکەم لێ دەکرد عەرزم کردن کەمن زۆر حەزلە بەتەنهایی دەکەم وە زۆریش ئاسوودە بە خەیالات پەیدا دەکەم ئەمە خاسیەتێکی مندالیمە، من ئەم خاسیەتەم زۆر چاک لە قولە بەکاردەهێنا سعاتەها لەسەر ئەستیورە زەلامەکانی دەوری قولە دائەنیشتم سەیری شەپۆلە وردیلەکانی قولە دەمێک‌و سەیری وێنەی (چیای رەش) کە لە ئاوەکەوە دیار بوو دەمێکی ترم دەکردو هەزاران چەشنە خەیالاتی ئەوساکە دەستەلاتم بەسەردا ئەشکا بە مێشکمدا ئەهات ئەمانە وردە وردە جوانی تەبیعەتیان لە دڵ چەسپاندم چاویان بە رەونەقی خۆیان گەلاوێژ دەکردم هەرکە مەکتەب کرایەوە

بەتەبیعەتی حال چوومەوە مەکتەب بینای مەکتەی کۆنە بوو،دیسان هەیوانێکی درێژو دالانێك بەسەر حەوشەیدا ئەنواری‌و لەناو دالانەکە دوو هۆدەی ئەم بەرو ئەوبەر بوون کە یەکێکیان سنف ئەویتریان هۆدەی (معلم) بوو، عەدەدی قوتابی لە بیست کەس زیاتر نەبوون، هەندێ زۆر گەورەو لە منیش بچووکتریان تێدا هەبوون لەبەروەی کە هەریەك موعەلیمان هەبوو نەماندەزانی کە کامەمان سنفی یەك‌و کامەمان سنفی دووین بەیانیان وەکو لە مەکتەبی کۆیە لە حەوشەی مەکتەب رێزنە ئەبووین کە (نەشید) بلێن یان سەیری پاك‌و خاوێنی دەست‌و پەلمان بکەن، بەلکو هەر ئەهاتینە مەکتەب لە هەیوان‌و حەوشەکە دەستمان ئەکرد بە یاری کردن تا موعەلیمە ئەفەندی لە ژوورەکەی خۆی ئەهاتە دەرەوە چونکە هەر لەم ژوورەش ئەنووست یەعنی مەکتەب مالی‌و جێگەی خوێندنیشی بوو بەدەست ئیشارەتی بۆ ئەکردین هەر کەسە شوێنی خۆی لەسەر تەختەکانی لە هەیوان رێزکراوە دەگرت موعەلیش سەر مەشقەیکی لەسەر تەختەی رەش بۆ ئەنووسینەوەو خۆی ئەچووە ژوورەوە هەندێکیان لەوانە بوون کە قورئانیان لای (مەلا) ختم کردبوو موعەلیم تەکلیفی لێ ئەکردن کە دەرسی قورئان بەوانیتر رەوان بکەن، من یەك لەوانە بووم کە دەرسی قورئانم لای (عبالقادر) ناوێك رەوان دەکرد. ئەوەل رۆژی کە چومە مەکتەبی رانیە

قوتابی یەکان دەورەیان دام یەکێکی سوورەی موو زەردی چوار پەل ئەستووری چاو شین ، بەلامدا هات بەبێ موقەدیمە ووتی: چاوت بەو دوو ئەنگوستە دەربهێنم!! زۆر سەیرم پێهات چونکە چ حاجەتی نەدەکرد ئەم تەکلیفە ناخۆشەم لێ بکات من وامزانی گاڵتەم لەگەڵ دەکات، زۆر بە بەساتەت بێ موبالاتی ووتم «دەبزانم؟!» هەر هێندەم زانی ئاگرم لە چاو بلند بوو چونکە هەردوو ئەموستی لەچاوم راکرد من لە گریان و ئەوانیش لە قاقای پێکەنینیاندا.. نازانم چۆن چاوم بێ زەرەر دەرچوو، پاش دەمێك چاوم هەڵهێنا نەم ئەتوانی کە تەحەمولی رۆناکی بێ بکەم چوومە ژوورەکەی موعەلیم ئیزنم لێ وەرگرت کە بچمە ماڵەوە. لە پاش ئەو حادیسەیە منو ئەو کوڕە بووینە برادەرێکی زۆر مەتین. ئیعتمادم زۆر لەسەری دەکرد زۆریشی ئیعتماد لەسەری دەکردم وە لەعەینی وەختا ئینقلابیکیشی فرێدایە ژیانمەوە ئەویش هاوێشتمیە ناو جوولانەوەو رانەوەستان، بەتەبیعەتی حاڵ فێری تۆپێنی و قاشەوانی و سێباز لە ئەم چەشنە یاریە عەنیفانە بووم لەم رووەوە زۆر قەرزاری (عوسمان)م .. لە رانیە ئەوها رامبوارد تا مامم جەمیل ئەفەندی کە ببووە موخەمینی دەغل لە (زینوێ) لەسەر ئەسپ کەوت وەفاتی کرد، باوکم ناردی لەشوێنی (کاکەم سەعدی) کە لە هەولێر (موداویمی) مەحکەمەو بە تەعقیبی دەعاوی‌یەوە مەشغول بوو. هاتە رانیەی. کە تەعزیە تەواو بوو، کاکەم سەعدی سەیری ئیستیعدادی کردم زانی کە من لە رانیە دەفەوتێم تەکلیفی لە باوکم کرد کە لەگەڵ ئەو بچمە هەولێر بۆ خوێندن . من ئیستیعدادێکی کافیم هەبوو لەو مودەتەی کە لە رانیە بووم بەواسیتەی مەراقی شەخسیم زۆر محاوەلەی فێربوونم دەکرد هەر شتێکی نوسراوم بدیبایە ئەمخوێندەوەو ئەمتوانی کە بە کوردی زۆر چاك بنووسم باوکم بەرامبەر ئەم تەکلیفە مومانەعەتی نیشان نەدا..

هاوینی ساڵی ١٩٣٠ بوو کە مانگ هەڵات لە خەویان هەڵساندم سواری ئێستریکیان کردم لەگەڵ کاکەم سەعدی رێگەی کۆیمان گرت کە گەیشتینە کۆیە هەموو بەجارێك بە پیرمانەوە هاتن منیان وەرگرت، ئیتر دوو رۆژ لە کۆیە ماینەوە .سواری ئۆتۆمبیل بوین هاتینە هەولێر یەکەم جار بوو لە حەیاتی خۆم کە سواری ئۆتومۆبێل ئەبووم، کەچی هەر وەکو ئەیان ووت:ئینسان لەناو ئۆتۆمبیل سەری بەگێژەوە دێتو ئەرشێتەوە. وانەبوو، زۆرم لاخۆش بوو پاش نیوەڕۆیکی

درەنگ بوو کە گەیشتینە هەولێر لە ماڵی پورم دابەزین چونکە لەم سەفەرە پوریشمان لەگەڵ گەڕایەوە، هاتبووە کۆیە بە موناسەبەتی تەعزیەی مامم، شەو لە ماڵی پورم نەنووستم بەلکو لەگەڵ کاکەم سەعدی هاتینە خوارەوە لە ماڵی خۆمان نووستم خاوخێزانی کاکەم سەعدی بەموناسەبەتی سەردان هەموو چووبوونە ماڵی ئاسەف براەم لە مەخمورلەبەر ئەمە کە بۆ رۆژی دووایی داهات ئۆتۆمبێلمان گرت چووینە مەخموور، مەخموور لە رانیە گەورەترو لە کۆیە بچووکتر بوو بەلام وەکو رانیە فێنکو ئاوی ساردی نەبوو، بەلکو شارێکی وشکو ئاوی تاڵ، بێجگە لە نادی چ شوێنی وای لێ نەبوو کە درەختی تێدا بێت. لە مەخموور هێندە نەمامەوە بەلکو لەگەڵ ماڵی ظاکەم مسەعدی هاتینەوە هەولێر، هەولێرم لا غەریب نەبوو، بەلام دیسان گۆڕابوو بەردەمی قەلاتی هەولێر کە جێگەی تۆپی رەمەزان و هەڵخستنی جۆلانەو چەرخ و فەلەکی جەژنان بوو، ببووە ریزە دوکانێکی بلند بلندو سەرەکەی کرابووە ئۆتێلو چایەخانە، مەکتەبی جاران و پۆستەخانە یەکێکیان ببووە گەراجی ئۆتومبیل ئەویتریان ببووە چایخانە، بەلام خانەقا هەر وەکو جاران بوو.

کە گەڕامەوە هەولێر قاتێك ئەلبیسەی سەترەو پانتەلۆنیان بۆ دورست کردم، ئەمە یەکەم جارم بوو کە ئەم چەشنە ئەلبیسانە لەبەر بکەم.

ئەگەرچی لە هەولێر لەلایەن چ شتێکەوە نوقسانیم نەبوو بەلکو وەکو مەلێکی فێری دەشت بووبێ لەناو قەفەس دابنرێ بەم جۆرە دڵم لێی ئەگوشرا خاسەتەن قیرە قیری براژنم کە جاران خالۆژنم بوو کاکەم سەعدی مارەی کردبۆوە، دوو کچەکەی خالی بەخێو کرد، یەکێکیانی دایە (ئاسەف)[٩] ئەویتریانی لە حەمیدی برام مارە کرد کە لەسەر هەموو شتێك شەرێکی دەکرد من رقم لە ماڵەکە ئەبۆوە، یەکەم ئیشتیاقی رانیەدەووەم بێزار بوون لەهەولێر منی هاوێشتە سەر ئەمە تەکلیف لە کاکەم سەعدی بکەم کە بمنێرێتەوە رانیە، بەلام کاکەم سەعدی دڵی دامەوە وە لێی پرسیم بۆچی حەز دەکەیت بچیەوە رانیە؟ پێم ووت: کەلە هەولێر بێزار بووم.

لەسەر ئەمە ئۆتۆمبیلی بۆ گرتم و ناردمیە مەخموور، وە ووتی: برۆ مەخموور کە مەکتەب کرایەوە بۆ ئاسەف دەنووسم دەتنێرێتەوە هەولێر، تۆ نەهاتوی بۆ کەیف هاتوی بۆ خوێندن پێویستە بخوێنی، بەم جۆرە چوومەوە

(٩) ئاسەف برای دلدار بووەو لەم گەورەترو لەسەعدی براگەورەی بچووکتر بووە .

مەخموور (الحمدلله) لە قرەقری شەروشۆری مالی کاکەم سەعدی هەولێر رزگار بووم، لە مەخموور بە رۆژ ئەچوومە دائیرەی تەحریرات کە ئاسەف تێدا مودیر بوو سەیری ماکینەی نووسینم دەکرد کە چۆنی پێ دەنووسن لە حەیاتما تووشی شتی هێندە سەیر نەهاتبووم کە چاك سرنجم دایە دەستیان وام تەسەور کرد منیش ئەتوانم پێی بنووسم کە کاتبەکە هەڵستا چووم لە شوێنی دانیشتم حروفاتی ناوی خۆم ئەدۆزیەوە بە ئەموست لێم ئەدا ئەویش لەسەر کاغەزی ئەنەقشاند، کە ئاورم دایەوە ئاسەفم لەپشتەوە راوەستا بوو زۆر ترسام کە شتێکی خراپم کردبێ بەلام کە دیم پێدەکەنێ دلم داکەوت ئینجا ووتم «یاء» واوم نووسیوە هەر چەندێکی لە (نون) ئەدەم هەر (ح) دەنووسێ لەسەر ئەمە ئاسەف دەرسێکی (تایپ رایتەری) دامێ لە ئەسرارەکانی گەیشتم سێ رۆژی پێ نەچوو کاغەزێکی دوورو درێژم بۆ باوکم تەقدیم کرد لەسەر ئەمە ئاسەف سەعاتێکی زێرو لیرەیێکی (موکافاتی) دامێ، بەلام لە پاش دوو رۆژ سعاتەکەی لێ سەندمەوە بە حوجەتی ئەمەی یەکێکی چاترم بۆ لە موسل جەلب دەکا وە لیرەکەشم لای برازنم دانا کە گەرامەوە هەولێر بمداتەوە، بەلام کە گەرامەوە هەولێر نە سەعاتم پێ بوو نە لیرە.. سەعات هێشتا نەگەیشتبووە جێ لیرەش بەقەرز خەرج کرابو من لە مەخموور هەروەکو چاوم کرایەوەو فێری بە ماکینە نووسین بووم هەروها دووو شت منیان زۆر بەتین بۆ دوو شتی زۆر تازە رادەکیشا یەکیکیان موجادەلەیێکی کاکە ئاسەف بوو کە لە بابەت نیشتمان پەروەرییەوە لەگەلی کردم ئەویش بەم سورەتە بوو: -

پاش نیوەرۆ بوو کە لە هەیوان دانیشتبووین چایەمان دەخواردەوە کە ئاسەف لێی پرسیم: یونس تۆ چیت؟ جوابم دایەوە: «من یونسم چ بم؟» ئینسانم ووتی مرازم ئەمە نیە یەعنی تۆ خۆت بە کورد یان تورك یان ئینگلیز دائەنێت یان نا ؟ پاش گفتوگۆیەکی زۆر کە هیچی لێ تێنەگەیشتم بەلام یەك شتی لەعەقیدەو ئیدیعا گۆریم کەئەویش لیێان پرسیم تۆ چیت بلێم من کوردم .. دووسێ سەعات لەژێر تەئسیری ئەم ووتادانە مامەوە لە نیهایەتدا قەرارمدا کە رقم لەهەموو ببێتەوە ئەما ئەم قەرارە زۆر سەری نەگرت چونکە (بەهیە) کچی خالم ووتی با غەرامەفۆن لێبدەین ، بەدووای کەوتم کە چوینە سەر (غەرامەفۆنەکە) دەفتەرێکی خۆم لەسەر سندوقی غەرامەفۆنەکە داندرابوو ، من هەر هەلمگرت و فرێمدایە سەر ئەرز ، بەهیە خێرا هەلیگرتەوە ووتی ئەمە رەسمی مەلیك فەیسەلە

سەیدە کوری حەزرەتی حەسەنە فریێ مەدەرە سەر ئەرز چاوت ... کوێر ئەبێ من خۆشم دەوێت، ئیتر رەسمەکەی خێرا خێرا ماچ دەکرد ئیتر من ئەم رەسم ماچ کردنەو ئەم ووتارانەی بەهیە ووتارەکانی ئاسەفی سەداپا لە بیر بردمەوەو قودسیەتێك و پیرۆزیکی ئەم رەسمەم وا کەوتە دڵ کە خوا خوام بوو بەهیە لە ماچ کردنی رەسمەکە ببێتەوە منیش ماچێکی بکەم، فیعلەن دەفتەرەکەم لەدەست وەرگرت و بەخشووعەوە ماچم کردو لەسەر مێزەکە دامنا.. ئەمە دەرسی یەکەمی نیشتمان پەروەری بوو کە وەرمگرت و بەم چەشنەش لە دڵدا جێگیر نەبوو، بەلام لەپاش ئەم حادیسەیەش هەروەکو شتێکی تازەم دۆزیبێتەوە شعورم بە خۆم دەکرد کەمن یونسەکەی جاران نیم من... نیم کوردم، وە وام حەز دەکرد کە باز بدەمو بە کۆلاناندا راکەمو هاوار بکەم: «من کوردم، من کوردم..» ئەم ئینقیلابە غرورێك و غیرەتێکی دامێ کە نازانم وەسفی بکەم. من لە رانیە بەشانی کەلێ کەس تفەنگم دیبوو، هەتا باوکم تفەنگیشی هەبوو بەلام دایکم چونکە زۆر ترسنۆك بوو قەت نەیدەهێشت کە نزدیکی بکەوم ئەیقیژاند ئەیووت: « دەستی لێ مەدە ئەتەقێ» لەبەر ئەمە وام چووبووە مێشك کە تفەنگ دەستی لێ بدرێت ئەتەقێ نەمدەوێرا نەزدیکی هیچ چەشنە سیلاحێك بکەوم. لە مەخموور ئاسەف تفەنگی راو- ساچمە -و تفەنگی شەڕی هەبوو بەلام من تەبیعی هەروەکو دایکم بردبویە مێشکمەوە کە نابێ نزدیکی تفەنگ بکەوم. نزیکی نەدەکەوتم شەوێکیان ئاسەف دانیشتبوو، لەپێش چاوی من پاکەتێك فیشەکی هاویشتە ناو تفەنگەکەیەوە پاشان لوولەی لەمن کردو ووتی «بتکوژم؟» منیش ترسام خۆم هاویشتە پەنای لانکی نەسرینەوە لەسەر ئەمە ئاسەف زۆر پێکەنی، منی بانگ کردە لای خۆی ئیستیعمال کردنی تفەنگی فێر کردمو تفەنگەکەی دامە دەست تەکلیفی لێکردم کە فیشەکی تێبخەمو فیشەکی لێ بهێنمە دەرەوە هەر عەینی شەو ئیستعمال کردنی دەمانچەشی فێر کردم، بەم چەشنە روحێکی دامێ کە لە سیلاح نەترسم بەلکو زۆر حەزم دەکرد منیش وەکو ئەو تفەنگم هەبێ و هەروەکو خۆی پێی ووتبووم «حەزم دەکرد کە سەعی زۆر بکەم بە یەکەمین لە مەکتەب دەربچم تفەنگم بۆ بکرێت» ئیتر یەکەم خۆ ناسینم کە کوردمو دووەم ئیستعمالی سیلاح فێربوونم ئەم دوو شتە بە تەواوی ئینقلابێکی زۆر بەقوەتی خستە ماخۆلیاو ئایدیالمەوە. ئەو مودەتەی کە لە مەخموور مامەوە زۆرترین وەقتم بە مەکینەی نووسین و غرامەفۆن لێدان و هەڵپچرینی تفەنگ رائەبوارد کە شەوانیش

لەسەر جێگا رادەکشام خەیالم لە شەرە تفەنگوسواری دەکردەوە ئەم خەیالاتە ئەبا سەبەبێکی بۆ ئیجاد بکەمو هەردەم سەبەبەکەش ئەمەبوو کە کوردو...... بەشەر بێنو لەسەرچی؟ نازانم..

کاغەزی کاکەم سەعدی هات ئەمەی تێدا بوو کەوا مەکتەب بەم زووانە ئەکرێتەوە پێویستە بگەرێمەوە هەولێر، فیعلەن پاشی دوو رۆژ من لە هەولێر بووم دیسان هاتمەوە نێو شەرو هەللای براو براژنم بەلام ئەمجارە بەهیەشم لەگەل هەناردرایەوە، بەهیە ئەگەر چی بە عومر بە سێ سال لەمن گەورەتر بوو بەلام خۆی لە تەرازوی مندا ئەکێشا زۆرمان یەکتر خۆش دەویستو زۆریشمان رق لە یەکتر ئەبۆوە لەسەر هیچ لەگەلم بەشەر دەهات زۆر خراپی لێ ئەدامو زۆر زووش ئاشتی دەکردمەوە دەستی لە مل دەکردمو ماچی دەکردم، کچێکی زۆر خەیالی بوو بەلام خەیالەکەی هەردەم لەتەسەور کردنی شتی نا جائیز بەکار دەهێنا مەسەلا لەسەر ووتاری خۆی زۆر کەسی دیوە کە دۆستیان هەبووە فلانوفلان حەزیان لەیەکتر کردووە، فلان رەسمی بۆ فلان ناردووە ئیتر لەم لاووەوە بەهیە تەقریبەن کەسی بێ دۆست نەهێشتبووەوە. براژنم خەیاتەیی ئەکرد شاگردێکی هەبوو ناوی (نەعیمە) بوو کچی پیاوێکی شەربەت فرۆشی فەقیر بوو، بەلام نەعیمە کچێکی زۆر دلارامو جوانو زۆر وریاو دەم بە پێکەنین بوو لە خۆم بە دوو سێ سال بچووکتر بوو بەلام زۆر لەمنو بەهیە عاقلتر بوو زوو زوو تێك دەچووین، بەلام هێشتا ووتارێکی وای نەووتوە کە دلم لێی شکابێ . زۆر جاران کە منو بەهیە پێکەوە بەشەر دەهاتین نەعیمە شاهیدی بۆ ئەدام کە خەتای من نەبووە کە کاکەم سەعدی وەیا براژنم دلیان دەشکاندم نەعیمە] لەگەل من دائەنیشت غەمی لەگەل دەخواردمو لەگەلم ئەگریا ئەمە خۆشەویستی نەعیمەی رۆژ بە رۆژ لە دل زیاد کردم، زۆرم لا خۆش بوو لە دەمانی عاجزیمدا نەعیمە خۆیم بەسەر شانیدا بدا وەکو جاران سەرم بخورێنێو بە دەنگێکی بە گریانەوە پێم بلێ «بیغلەما قایدی یوغتی» ئێستا وا پاش پانزدە سال ئەم موزەکەراتە ئەنووسمەوە هەست بەمە دەکەم کە قوەتێکی خاس،قوەتێك کە هەمووی وەفاو خۆشەویستیو برایەتی یە بەرەو نەعیمە رام ئەکێشێ، ئەگەر ئێستا لام بایە دەستەکانیم ماچ دەکردو ئەمەم تێئەگەیاند کە من ئەوساکە چەند موحتاجی ئەم (عێجزمەبەی) ئەو بووم.

مەکتەب پاشی مانگێك ئەکرایەوەنازانم بۆچی کاکەم سەعدی منی هێنایەوە هەولێر، لەگەل ئەمەش ئەم ئیحتیجاجەم بەکەس نەدەووت، لەسەر تەوسیەی

براژنم کاکەم سەعدی منی لای (مەلا برایم) ناوێك لە خانەقای شێخ جەمیل ئەفەندی لەبەر خوێندن دانا سوختەخانەم لا خۆش بوو چونکە زۆر کەسی وەکو منی تێدا بوو، هەموومان بە هاوین سوختەو بە زستان مەکتەبلی بووین مەلا برایم پیاوێکی باریکەلەی رەنگ گەنجی دەموچاو مەیلەو درێژ خروکاوی بوو جلکی پاك و خاوێنی لەبەر دەکرد، چاوەکانی رەش و مەیلە و بچووك بوو زۆر قەشمەرچار و دەم بە پێکەنین بوو، لەگەل ئەمەشا لەگەل سوختەکانی زۆر توورەو تەنگاو، لەسەر ئەدنا شت (فەلاقەی) ئەکردین، بەلام معامەلەیکی تایبەتی لەگەل من دەکرد چونکە برای سەعدی ئەفەندی بووم وە سەعدی ئەفەندیش دۆستی مەلای موحتەرەم بوو! پاش مانگێك مەکتەب کرایەوە مەدرەسەی ئەوەلی‌یەی کە ناوی (شعبە) بوو کە بە کوردی تەدریساتی تێدا دەکرا ئەم شەهادەیەی کە لە رانیە وەرم گرتبوو وە لە مەخموور بەهیە لێی درادنبووم و ئاسەف بە سەمغ بۆی پێك هێنابوومەوە لەگەل خۆم برد بەبێ ئەمەی کەسم لەگەل بێت چوومە مەکتەب، پرسیم هۆدەی مودیر ئەفەندی لە کوێیە؟ فەراشێك نیشانی دام چوومە ژوورەوە ئەفەندیەکی گەنج بەسام دانیشتبوو، بەسەر ئیشارەتی کردم کە چیم دەوێت! چوومە پێشەوە بەدەست سەلامێکم کردو شەهادەکەم دایێ، خوێندیەوە ووتی تۆ یونسی برای ئاسەفی؟ ووتم «بەلێ» ووتی ئیمرۆ مەکتەب نیە سبەی نا دووەی رۆژی شەموو وەرەوە تۆمان لە سنفی سێ قەید کرد، ووتم «باشە» سەلامێکم کردو چوومە مال بەدەنگێکی بەرز ووتم «چیتر ناچمە سوختەخانە» ئێستا چوومە مەکتەب خۆم قەید کرد، براژنم ووتی: چاکت کرد»...

رۆژی شەموو هات زۆر بە نیشاتەوە چوومە مەکتەب لە حەوشەکە ریزیان کردین ناویان خوێندینەوە لە پاشان سنف سنف هەر سنفە چووینە ژورێکی تایبەتی‌یەوە ئەتوانم بلێم زۆرترینی سنفی سێ‌یەم لە خۆم بە عومەر زۆر گەورەتر بوون، غەریب بووم لە ناویاندا هیچ کامیانم نەدەناسی، غەیرەز ئەمەی کە لە تەکمەوە دانیشتبوو ناوی خۆمان بە یەکتر ووت ناوی ئیسماعیل حاجی کەریم بوو ئیسماعیل یەکەم کەس بوو لە مەکتەب ناویم زانی و بووینە برادەری یەکتری بەرە بەرە رۆژ بە رۆژ هەوالەکانم ناسی بەلکو بە وردی سەیری هەلستان و انیشتنیم دەکردن ئەمە (حەمید کەریم)ە کورێکی رەنگ زەردی جفارەکێشی مەرو ریشدارە، لە هەلستان و دانیشتندا وا بە دیار دەکەوێ کە ئەخلاقی زۆر

چاك نيه، ئەمە (كەريم شەريف)ە كوڕێكی كورتە باڵای دەموچاو پان لووت باريكی چەناگە هەڵگەڕاوەيە ڕەنگێكی گەنمی مەيلەو ئەسمەری هەيە زۆر ڕەفيقی (حەميد كەريمە) زۆر جاران پێكەوە حەياتی شەوی ڕابوردويان بۆ يەكتر ئەگێرنەوە، كە چۆن قوماريان كردووەو شەو لە باغی سەعيد ئاغا ڕايانبواردووە، ئەمە (نەجمەدين)ە چوار شانەی ورگ زەلامی ڕەنگ زەردی ددان شاشی چلكنی دوو دان زێرە، كە هەردەم جغارە بە جغارە پێ ئەكات كە وەختی ئيستراحەت هات لەسەر جێگاكەی خۆی نابزوێت بەلكو مێزەكەی ئەكاتە تەپڵ بەستە ئەڵێت و مل با ئەدا:(نجم الدين) دەنگی زۆر خۆش بوو بەڵام كە هەر بەستەی تووركی دەزانی ئەم سێ كەسە بەتايبەتی هەموو لايەك خۆمان لێ ئەپاراست زۆر تخونيان نەدەكەوتين، بەڵام لەگەليشيان بەشەر نەدەهاتين چونكە لە ئێمە گەورەتر بوون ئەوانيش بە چاوێكی بچووكەوە سەيريان دەكردين بەڵام بەرەكەتدا هيچيان نەدەزانی لەلای هەيئەتی موعەلمين ، ناويان (گای ناو گۆلكان) بووئەمە حيسام نافيع ئاغايە، كوڕێكی چوارشانەی سەر گەورەی باڵا بەرزە، لێو ئەستور ڕەنگ زەرد چاو ڕەش جلكی زۆر جوانی لەبەر ئەكرد، بەڵام نازيرەكترين كەس بوو، حاجی كەريم ئەفەندی موعەليم ناوی لێنابوو «حەپە لۆری مێش خۆر» ژيانی شەخسيم لەمەكتەبدا لەوانە نەبوو كە ديار بم بەڵام ئيهماليش نەدەكرام لە هەموو دەرسەكان وەك باش نەبووم لە هەندێكيان وەكو (تەئريخ و جوغرافياو دين و ئەشيا) يەكەم بووم، لە حيساب متەوەسيت، لە عەرەبی نەزان بووم، زۆر ڕقم لە ڕيازە دەبووەوە هێندەی پێ نەچوو كە خاوەن خانووەكەی ئێمە تێدابووين ئيسراری كرد كە لێی دەربچين كاكەم سەعدی چوو لە قەلات لەتەك مالی يوسف ئەفەندی قازی خانوێكی يەك چاوەيی گرت ئەگەر چی ناخۆشی و تاريكی و كۆنی خانوەكە زيكرەياتی كۆنی براژنمی هێنابووە جۆشش و دەمو سەعات بەدەم شەرەوە باسی خۆشی خانوی خۆيانی دەكرد منەتێكی دوورو درێژی بەسەر خوادا دەكرد كە بەم حالە ڕازيە وە هەتا بەهيەش چونكە دەستەخوشكەكانی لە دەست چوو بوو جار بەجار بەدەنگێكی ناخۆشی زۆر لە نازكی و حەنانەوە دوور ئەگريا، ئەمە بەتەبيعەتی حال سەبەبێكی زۆر مولائيم بوو كە ئاگری فيتنە لە مالی ئێمە نەكوژێتەوە بەڵام من كەری خۆم بەستابووەوە هەر لە مەكتەب دەهاتمەوە لەگەڵ جەليل يوسف ئەفەندی كە پێكەوە لە مەكتەبيش لە سنفێكا بووين بە ياری تا ئێوارەمان ڕادەبوارد، بە واسيتەی جەليلەوە زۆر كەسی تريشم ناسی وەكو

(جەلال قادر) کە برازای حاجی موستەفای توتنچی بوو، لە مەکتەبی ئیسرائیلیەکان لە سنفی سێیەم ئەیخوێند، جەلال کوڕێکی سپیلکەی چاو گەورەی دەم بە پێکەنین بوو، کوردی زۆر چاك نەدەزانی منیش تورکیم چاك نەدەزانی، بەلام بەراستیش یەکترمان خۆش دەویست پاشان (موستەفا موحەمەد)م ناسی کە کوڕی محەمەدی تەها بوو لە سنفی پێنجەم ئەیخوێند، موستەفا کوڕێکی کورتە بالا سەر گەورە چاو زیندووی ڕەنگ گەنجی بوو، زۆر بەتین بوو لە بەتینی قەدرمان ئەگرت ئەم تیپە هەر بە یەکەوە ئەگەراین.

لەم ئانەدا بوو کە کاکەم ئاسەف ماڵو منداڵی هەناردەوە هەولێر چونکە لە وەزیفە دەستیان لە ئیش کێشابووە، تەبیعی ئەم خانوەی کە تێیدا بووین زۆر بچووك بوو لەبەر ئەمە خانوێکی ترمان لە خوارەوە دیتەوە کە دوو هۆدە بوو یەکێکیان لەسەرەوە ئەویتریان . لەخوارەوە بەلام ئەمەندە کۆن بوو کە تەسەور نەدەکرا چۆن ڕاوەستاوە لێرە شتێکی خۆشم بەیاد کەوتەوە ئەویش سێ چوار ڕۆژ بوو براو برازنم شەرە دندوکیان بوو بەلام (مع الاسف) هەموو ڕۆژێ کاکەم سەعدی کە دەهاتەوە لە دەرگەوە برازنم بە ورگی زلیەوە کلاوەکەی خوار دەکردەوە یەکەم تەوانجی تێدەگرت و نەدەگرت کاکەم بەدەم و چاوە باریك و لۆچ لۆچاویەوە پێدەکەنی ، چەند ڕوپیەکی بۆ دەرئەهێنا هەروەکو لەم پارەیە (مفاوەزاتی) سولح بکاتەوە ئیستیعدادی نیشان ئەدا ئەویش پارەکەی لە دەستی با ئەداو نیو ڕوپیەی ئەدایەوە دەست، ڕۆژێکیان خۆی و بەختی کە چ پارەی پەیدا نەکرد بوو تەبیعی دبلۆماتیکیاتی سەلەفەن بێ قیمەت بوو، شەر هەلگیرسا خێرا کاکەم سەعدی ڕایکردە دەرەوە شەو درەنگ هاتەوە من و ئەوان لە هۆدەی خوارەوە دەنووستین شەو کە هاتەوە یەکتریان نەدواند بەیانی لەوسەری من لە هاوار هاوارێك ڕاپەڕیم کە سەیرم کرد..

برازنم کاکەمی لە ژێر خۆی ناوە پێی دەڵێ: وەللا ئەمجارە لەبەر دەستم ڕزگار نابی خۆ لە ڕقی تۆ شەقم برد!! کاکەشم هاواری دەکرد کچێ ڕاوەستە شتێکم دۆزیەوە نازانم چیە؟ ئیتر لەم مشت و مرە ڕاست بوومەوە لە جێی خۆمەوە ئەمزریقاند ئەمووت (براژن بەرەحمەللای نەکەی ڕاست بێتەوە ئەتکوژی!!) بە کاکەشم ئەووت:(ئەگەر ئازای خۆت لەبەر دەستی بەرەڵلا دەکەی!!) مرازم ئەمەبوو کە لەم حالە دەوام بکەن، چونکە زۆرم لا سەیر بوو کە



« دڵدار لە تەمەنی دووانزدەساڵیدا »

ژن پیاو بهاوێته ژێر خۆی) بەڵام تەوەسولاتی کاکەم سەعدی براژنم لەسەر سنگی لاکەوت کە هەڵستا دەستی درێژ کردە مێزەکەی ژوور سەریانەوە کە هەمانەی زەخیرەی لەسەر ریز کرابوو شانەیکی بچووکی سەرانی هێنا دەرەوە ووتی: ئا ئەم شانەیە هین کێیە؟ براژنم ووتی ئەمە شانەی بەهیەیە سێ چوار رۆژە هەراسانی کردووم بەخوای چاك بوو دۆزرایەوە بەم گوێرەیە سەد بارە ئاشتی بە شەرمەزاریو تەرەدودەوە لە دەرگا هاتە ژوورەوەو شەر ئەمانەتەن خۆی لە پشت دەرگا شاردەوە، ئەوێ رۆژێ یەکەم ئیشم لە مەکتەب ئەمەبوو کە ئەم حادیسەیەم بۆ باوکم نووسی باوکیشم بە تەعلیقەوە کە هەمووی هەزەلیات بوو بۆ کاکەم سەعدی ناردەوە لەسەر ئەمە کاکەم سەعدی زللەیکی لە بنا گوێ داموسوێندیشی خوارد کە لەنێو پاش بە زللە قسە لەگەڵ هەموو کەسێك بکات براژنم ووتی: لەگەڵ منیش؟ ووتی کێ لەگەڵ تۆیەتی!!

کاکەم ئاسەف لە بەغدا گەرایەوە هەر لە عەینی گەرەك خانوێکی زۆر خۆشی گرت ئەشیامان گواستەوە ناوی ژیانێکی تازە کەوتە مالی ئێمە،بەلام وا نەبێ ئەم ژیانە چ تەئسیرێکی مەحسوسی کردبێتە سەر شەرو ناکۆکی بەینی کاکەم سەعدیو براژنم بەلکو ئەم ناکۆکییە هەرمابوو بەلام هیچ کام لا بەراستیان نەبوو «نەعیمە» چیتر شاگردیەتی براژنمی نەکرد، رۆیشتنی نەعیمە بەتالییەکی زۆری لەبەر چاوی مندا بەجێ هێشت بەتالییەکەی هەر لەبەر ئەمەنەبوو کە زۆری خۆش دەویستم بەلکو شتومەك کرین لەبازار لەسەر شانی نەعیمە بوو کەوتە سەر شانی من ئەمەم زۆر پێ ناخۆش بوو بەلام مەجبووریش بووم بیکەم، کەم رۆژ وابوو دوو جار گۆشتم پێدا نەنێرنەوە بازار ئاخری توورە ئەبووم چیتر بە قسەم نەدەکردن لەسەر ئەمە شکایەتیان لێ دەکردم کاکەم سەعدی بە شکایەتی وان وەك بورکانێك بەسەر سەری مندا ئەتەقی بەلام زۆر جاران ئاسەف موحافەزەی دەکردمو بە نەرمی دلی ئەدامەوە کە کاکە سەعدی برای گەورەیە ئەبێ لە قسەکانی عاجز نەبم من ئەمزانی کە کاکەم سەعدی لەسەر ئەمەی کە زوو لێم توورە ئەبوو زۆریشی خۆش دەویم ئەم لە ئاسەف چاکتر سەیری نەواقیسی دەکردم، بەلام من لە دلدا ئاسەفم لە ئەو زیاتر خۆش دەویستو زیاتر مەیالی ئاسەف بووم.

لەم تەئریخە ئاسەف بێ ئیش بوو، زوو زوو سەفەری بەغدای دەکرد بە واسیتەی برادەرایەتی کە لە بەغدا پەیدای کردبوو، توانی تەئسیرێکی وا بکات

...

که ئیجازەی (محاماتی شەرعیە) بۆ کاکەم سەعدی ئیحراز بکات، بەمە کاکەم سەعدی بوو بە (محامی) ئەو رۆژەی کە ئیجازەی محاماتی بۆ هات شەرێکی زۆر گەورە لەبەینی ئەم و ژنەکەی قەوما، شەرەکەش لەسەر ئەمە بوو کە نابێ براژنم خەیاتەیی بکات ئەویش رازی نەدەبوو، ئاخیری موەفە ق بوو بەشەرو قیرەقیر پێی سەلماند، ئەمە وا بزانم یەکەم (ئینتیسار) بوو کە لە حەیاتی ژن و مێردایەتی ئەودا رووی دابوو.

ئاسەف برادەرێکی زۆری ئەهاتنە لا زۆر جاران منیان دەرئەکردە دەرەوە دەرگایان لەسەر خۆ پێوە ئەدا، ئەم ئەزانی بۆچی؟ شەوێکیان (سەعدی جەلالی) موعەلیم هاتە لای ئاسەف سەعدی جەلال گەنجێکی ئەسمەری قەدە بالای خوێن شیرین چاوەکانی رەش و گەورە جلکی زۆر جـوان و رێك و پێکی لەبـەر دەکرد، لەپاش ئەمەی کە دانیشت منیان دەرکردە دەرەوە هێندەی پێ نەچوو ئاسەف منی بانگ کرد چوومە لایان سەعدی جەلال پێی ووتم (یونس) تۆ لە مەکتـەب رەفیق و برادەرت زۆرە؟ ووتم بەڵێ ووتی شتێکت پێی دەڵێم ئەگەر بە قسەم بکەی پایسکلت بۆ دەکرم ووتم: بەبێ پایسکل بە قسەت دەکەم،هەندێك پێکەنی و ووتی: ئافەرین، تۆ کوردیت؟ ووتم بەڵێ کوردم، ووتی گوێگرە هەموو رۆژێ لەمەکتەب لەگەڵ برادەرەکانت یەکتر بگرن بەخۆتان بڵێن «بەچەشێر» وە ئەوەی ووتی من کورد نیم لێی بدەن» ووتم «باشە».

بەیانی لەمەکتەب بای‌سێ ئانە قەزوانی سوێرم کـری، بەسـەر سێ‌چوار برادەرم دابەش کردو پێم ووتن: «ئێمە کوردین بەچە شێرین با بگەرێین ئەوی نەبێتە بەچەشێر بەچە ریوی‌یە لێی بدەین» ئەم فیکرەیـان زۆر لا خۆش بـوو، گـەراین سێ چوار کـەسی تریشمـان بە زەبـری مشتەکـوڵەو دەنکـە قـەزوان کردە(بەچەشێر) هەفتەیێکی پێ نەچوو کە مەکتەب زۆرترینی ببوونە بەچەشێر هەر فیتفیتەی ئیستراحەتی لێ‌ئەداو نەئەدا بەجارێك لە هەموو لایێك هەللا بلند ئەبوو ئەیان ووت «بەچە شێرین، بەچە شێرین»و راوی بەچە ریویەکانیان دەهێنا، شکایەت زۆر بوو ئیدارەی مەکتەب پێی زانی، رۆژێکیان مودیر کۆی کردینەوە ووتی:

«لەناو پاش ئەوی بڵێ بەچەشێرم سەری دەشکێنم، ئەوی بڵێ بەچە ریویم لاقی دەشکێنم، هەمووتان بران کوری پیاوانن»، (کوردن) واز لەم شەرو هەللایە

بهێنن، ئەوی وازی لێ نەهێنێ لە مەکتەب دەری دەکەم.. بەمە ئیدارەی مەکتەب ئیستراحەتی کرد قەزوان فرۆشیش چیتر قەزوانی نەهێنایە مەکتەب... ئەم مناوەرەیەی سەعدی جەلال بەم دوو کەلیمە قسەیە نیهایەتی هات بەلام لەپاش شەش ساڵ تەئسیری خۆی بەخشی، پاش مانگێك لەپاش حادیسەی مەکتەب شەوێکی زۆر سەرمای بەهار کاکە ئاسەفم منی بانگ کردە ژوورەکەی خۆی پیاوێکی تری لا بوو کەوایێکی شۆرەیان لەبەرکردمو جامانییەکیان لەسەر نام ئاسەف ووتی«لەگەڵ کاك رەشید برۆ» چیت پێ بلێ وابکە منیش ووتم «باشە» باران زۆر بەتاو ئەباری بایکی بەقوەتی ئەهات تاریك بوو چاوچاوی نەئەدیت، منو کاك رەشید رۆیشتین تا چووینە دەرەوەی شار، لەوێندەر پیاوێکی تر ئینتیزاری دەکردین، هەرسێکمان رۆیشتین لەبەر رۆناکی بلاچەی بروسکە بەرخۆمان ئەدیت خۆمان لە کێڵو بەرد ئەپاراست لە رێگا رەشید پێی ووتم «ئێستا ئەچین بۆ ماڵی زابتی ئیستخبارات، شتێکت ئەدەمێ تۆ ئەچی لە دەرگا ئەدەیت خزمەتکارێکی هیندی دێتە دەرەوە شتەکەی بدێو بلێ ئەمە بۆ فەخامەتی مەندوبی سامییە گەر ووتی راوەستە، تۆ کێیت..؟ ناوی خۆتی پێ مەلێ وە رامەوەستە گەر پەلاماری دایت بتگرێ راکەو بلێ:ئاگر..ئاگر..باشە» ووتم باشە...تێگەیشتم.. بەپشت قشلە سوراینەوە چووینەوە بەر تێلخانە، لەوێ سوراینەوە، رێزە خانوییەك هەبوو رەشید ووتی: «دەرگای دووەم هەوە، هانی ئەم زەرفە ببە» زەرفێکی درێژی دامێ زەرفەکەم وەرگرتو چووم لە دەرگامدا پیاوێك ووتی: «منوهای؟ ووتم«ئەنا.. هات دەرگای لێ کردمەوە، بە لەهجەیێکی هیندیانی ووتی شتریت؟ زەرفەکەم دایێ ووتم «فەخامەتی مەندوبی سامی» سەیرێکی دوورو درێژی کردم بەددانە سپییەکانی پێم پێکەنی ووتی «زین...زین...» ئیتر زەرفەکەی وەرگرتو من گەرامەوە، رەشیدو کابرایەکەی تر لەسەری کۆلانەکە لەپەنا دیوارێکا راوەستا بوون، سەیرم کرد هەردوکیان دەمانچەی رووتیان بەدەستەوە بوو ووتم «دامێ» رەشید ووتی راوەستە وەرە دوام ئیتر کابرای کە نەمناسی لەسەر جادە لایدا، منو رەشیدیش بە دەرگەی ئەحمەدیە بەسەر قەلات کەوتینو بە دەرگەی گچکە هاتینە خوارەوە، رەشیدیش لەسەر جادە بە لایکا رۆیی کە هاتمەوە ئاسەف دانیشتبوو ئینتزاری ئەکردم ئیتر بەبێ ئەوەی چ قسە بکەم پاوپلی خۆم شووشتو جلکی خۆم لەبەرکردو چووم لەبەر ئاگر بەرامبەری دانیشتم، ئاسەف ووتی «ماندونەبی» ووتم دەستت ماچ دەکەم ئیتر هەنارێکی

دامیٚ و ووتی ئەمەی ئیمشەو بەکەس نەلێیت، ووتم باشە.

حەرەکاتی شێخ مەحموود دەستی پیٚ کردبوو، کە عەلی مەحموودی کاکە خانی لە حکومەت عاسیٚ بوو کوردایەتی لە هەولێر بەدەرەجەیێک شیدەتی ستاندبوو کە ئەتوانم بلێم زۆر بە هیستریا ئەچوو، بەلام سەبەبی هەرە گەورەی ئەم کوردایەتی یە عاسیٚ بوونی عەلی مەحمودو دیعایەی منەوەرەکان، خاسەتەن ئەم دوو سیٚ تفەنگە بوو کە لە پاش هاتنی مەندوبی سامی بۆ هەولێر، شەوێک بەم شەوە تاریکەی بەهاردا بەهەولێرەوە نران، حەقیقەتەن ئەتوانم بلێم ئەم دوو سیٚ تفەنگە کاری هەزاران دیعایەی کرد، من تەبیعی کە لەگەلّ نەفسیەتی خۆم رێک دەکەوت هیچیتری لیٚ تێنەدەگەیشتم هەر ئەمەندەم ئەزانی کە من کوردم و بەس وە واشم ئەزانی کە مادامەکی من کوردم، ئەبیٚ کورد لە هەموو دونیا ئازاتر بن وە چاکتر بن زۆر جار سەعید سەید عومەر ئاغای زاوام لەسەر ئەم وەتەرە توورەی دەکردم عەقلی پیٚ نەدەهێشتم، رۆژێکیان ئەحمەدی خواجە ئەفەندی هاتە لای ئاسەف پیی ووتم «یونس تۆ کوردیت...؟» ووتم «بەلیٚ» ووتی «کوا شاهیدت کە تۆ کوردیت..؟» ووتم «ئاسەف شاهیدمە» ووتی «ئاسەف بە شاهید ناشیٚ» ئیتر نەم ئەزانی چۆن جوابی بدەمەوە، لەپاشان ووتی «من شتێکت ئەدەمیٚ. کە ووتیان بەچی بزانین تۆ کوردیت، ئەم شتەیان نیشان بدە»

دەستی درێژ کردە باغەلی دەفتەرێکی بچووکی دەرهێنا، لەناو دەفتەرەکە رەسمێکی دەرهێنا دایە دەستم ووتی «ئەمە شێخ مەحموودە مەلیکی کوردوستانە» منیش رەسمەکەم وەرگرت زۆر کەیفم پێخۆش بوو کە رەسمی مەلیکی کوردستانم لابیٚ، بەلام کوردوستان کوێندەرە؟ ئەمەم نەئەزانی لە کەسیشم سوئال نەدەکرد پاش دوو رۆژ موجەلەیێکی میسریم شەق و پەق کرد رەسمەکانیم دەرهێنا وەک شریت بە سەمغ بە یەکترەوە نووساندن «رەسمی مەلیکی کوردستانیشم لەگەل وان تێکم بەست ئەو سەری شریتەکەم لە دارێک خست و سەرەکەی تریشم لە دارێکیتر خست و دارەکانم لە سندووقێکی موقەوا چەسپاندو دوو کونم لە سندووقەکە خست بەم چەشنە «ئەستەنبولەباقان»ێکم دروست کرد لە محەلەکە سەیری منداالنم ئەدا، کە دەگەیشتمە سەر رەسمی شێخ مەحموود ئەمووت:« ئەمە شێری شێرانە مەلیکی کوردوستانە» بەم سوورەتە شێری شێران و مەلیکی کوردوستانم نیشانی مندالان ئەدا... کە هاوین

هات مەکتەب تەعتیل بوو داوام لە ئاسەف کرد کە ئەمەوێ بچمەوە رانیە، خێرا موافەقەتی کرد، بەتەنیا ناردمیانەوە لە کۆیە عوسمان سەعید بەگ[11] کە کۆنە رەفیقی مەکتەبم بوو ئەویشم لەگەل خۆم هەلگرت چووین کاروانچیمان دۆزیەوە بەمن و عوسمان ئێسترێکمان بەکرێ گرت، شەو لە خان نووستین بەیانی لەوسەری زوو کاروان باری کرد، هەموومان بەرێ کەوتین، هێشتا رۆژ لە هیچ لایەك هەلنەهاتبوو، کە بەسەر چناروك کەوتین، لە ژێر ئەم ئاسمانە شینە بەرینەدا کزە بای بەیانی بە پەنجەی سیحری یاری لە گەل رووی کردبن هەمووشتێك تازە لەخەو هەلسابوو گەرمایی ژیانی تێدا ئەجۆشا هەموو شتێك لە ناو رووناکی زۆر پاکی بەیانی لەناو ئەم فەیزە خودایە سەمای شادومانیان دەکرد لە هەموو لایێك مەل بالیان رائەوەشاند لەسەر ئەم دار بۆ ئەو دارە لەو قوچکە بۆ ئەم قوچکە زۆر بە نیشات و سووکی یەوە ئەهات و ئەچوون ئاورێکت لە پشتەوە بدابایەوە شاری (کویەت) لێوە دیار بوو کە تەمە دووکەلێکی وەکو سەرپۆشێکی ئاوریشمی شین بەسەر دلارامێکی جل سپی دادرابێ ئەوهابوو، لەژێر ئەم پۆشینە شینەدا خانوە سپی یە لە گەچ دروستکراوەکان لە میانی ئەم خانوە سپی یە مل کەشانە خال خالی سەوزت ئەدیت کە لق و پۆپی دارە بەرزەکانی حەوشەکان بوو، رەزەکانی کۆیەت وەك رووبارێك دەهاتە بەر چاوکە لە شیمالی غەربیەوە لە چیای باواجی یەووە هەلبوقلێ بە شیمالی کۆیەدا تا رۆژ هەلاتی شار درێژ ببنەوە، لە کەندولەندی رۆژهەلاتدا ون ئەبوو تا چاوت ئەروێشت هەر کەندو دەشتایی درێژە چیا بوو، کە دووایبەکەی لە ئوفقدا بەرێزە چیای دووکەلی دەهات لەناو تەم شارابوونەوە کە سەیری پێشەخۆشت بکردایە دەشتی بەرینی بیتوێنت ئەکەوتە بەرچاوکە سەراپا پاوانێکی بەرین هەموو بەپوشی سپی داپۆشراولەلای رۆژئاواو ژووریەوە بە چیا بەرزەکانی خۆشناوەتی وە لەلای رۆژهەلات بەدەربەندو چیا رەشەکەو جەنوبیشی (هەیبەت سولتان) بوو، ئەم چیایە بوو کە منی لەسەر راوەستا بووم. رۆناکایی تا ئەهات زیاتر تێنی ئەسەند، زیاتریش سینگ و دروشمی چیایەکانی بەدیار ئەخست رۆژ هەروەکو لەپشت فلکەی دەربەند خەرمانێك ئاگری تێبەر بووبێ بەم چەشنە خەرمانەی تیشکی بلێسەی سەند بەرە بەرە تا ئەهات جەرگی ئاسمانی سپیواژ ئەکرد تیشکی رۆژ لوتکە هەرە بەرزەکانی خۆشناوەتی روون کردبووەوە بە رەنگێکی ئالتونی داپۆشتبوو بەردەکانی رەنگاورەنگ ئەبریسقانەوە هەر ئەتووت قایشن لە کۆپکەی ئالتون

گیراون، له دیوی بیتوێندا ئوفق زۆر بەرین نی یە، بەلکو بەرینایییەکەی هەر له جنوبی شەرقەوەو بەس، چیا بەرزەکانی کوێستان یەك لەدوای یەك وەك هەور یەك بەسەر یەك کەوتو بەبەر ئاسمانا هەلچو و قەندیلیش وەك هەورێکی سپی هەموو نزار لێوی بەلێوی ئاسمانەوە نابوو ماچێکی ئەبەدیو سەرمەدی کردبوو هەردوو لایان لەم ماچەدا وەستاو لێو لەسەر لێو مابوونـەوە، هاژەی بـا فرەو چرپەی باڵدار زرەی زەنگولەی کاروان فرمە فرمی ئێستری مل قەوی کە بـە عەزمو سەباتێکەوە بەردیان ئەشێلاو بەسەر چیا دەکەوتن، دەنگی «دەی های» هەتیوە کـاروانچی چاورەش پـوزەوانە هـەلکێشراوی گـورجو گۆل کـە وەکو سوسکە لە هەلەتو پەلەتی چیا بەلاریدا بەسەر دەکەوتن، ئەمانە هەموو جارجار منیان لەم خەوە خۆشە رائەپەراند کە لە باوەشی تەبیعەتدا ئەمکرد راپەریم چ راپەرینێك هەموو[21] یەك پارچە عاتیفە، خۆم سەرخۆش سەیری عوسمانم کرد ئەو لە من سەرخۆشتر بوو،

زەردەخەنەیێکی زۆر جوانی لەسەر لێوی بوو، کە چاوە بچووکە شینـە کشتەکانی تێبریمو ووتی: «بەخوای دونیا جوانە» ئیتـر هەردووکمـان بەدوای کاروانەکەدا رێگا زۆر نشێوە قادرمە قادرمەکەمان گرتە بەر دەستمان پێکرد کە لە چیا بێینە خوارەوە هەردوو لامـان بەدەستـە خۆمـان نەبـوو، پێکەوەمـان دەستمانکرد بە گۆرانی ووتن دووبارە چوومەوە ئەو رانیەی کە دونیام تێدا ناسی دووبارە لەسەروچاوەی ئاوی رونی قولە مەلەم کردو لە ژێر دار بیە بەرزەکانی وەکو جاران پالم دایەوە

لەم هاوینەدا بوو کە باوکم لە وەزیفەی کاتب تەحریراتی رانیە عەزل کرا، ئەم خانوەی کە تێیدا بووین هین خۆمانبوو باوکم فرۆشتی دوانـزدە هێستری بەکرێ گرت، لە شەوێکی مانگە شەوەدا خۆمان ئامادە کرد کە بارکەین مالی ئێمە خەلکێکی زۆری کەوتبوێ تەقریبەن ئەهلی رانیە بەژنو پیـاوەوە هاتبـوون کە بەرێمان بکەن، لەم شەوە حادیسەییێکی زۆر سەیر لە مالەکەی دراوسێمان قەوما ئەویش مام عەولای چایەچی، چایخانەیێکی بچووکی هەبوو ئەگەر چی بازاری زۆر گەرم نەبوو، بەلام مام عەولا هەروەکو رقە لەگەل رزقی خۆی بکا، شەو تا درەنگ هەر خۆی چای بۆخۆی تێ دەکردو گرامەفۆنی لێئەدا، ژنێکی هەبوو ناوی فاتمەخان سالێ دوانزە مانگ چاوی ئەیێشا، فاتمەخان لەسەر کەپرە بەرزەکەی

(٢١) بەسیلە : بەئیجازە .

ناوەندی حەوشەی خویانٚ دانیشتبـوو گوێی لە غلو غلوی مـالی ئێمە راکـرتبو لەنکاوێك گوێمان لیٚ بوو کە فاتمەخان بانگی کرد «ئەوە کیٚیـە لە کژ دەرگـای ژوورەوەیە؟» ئافرەتێك لەسەر گوی سـواندەی ئێمـەوە پێی ووت «فاتمـەخان چیە؟» ووتی «گوڕانە» لەکژ دەرگەی ژوورەوەیە» ئیتر ئافـرەت شەش شـەش هاواریان دەکرد «گوڕانە، گوڕانە» بەمە ئەم پیاوانەی کە لای باوکم دانیشتبوون هەموو بەجارێك راپەرینو دەورەی مالی مام عەولایان دا دە پانزدە پیـاوی بە تفەنگەوەش بە شخاتە لێدان هەیوانو ژێر کەپری مالی مام عەولایان پشکنیەوە

هیچیان نەدۆزیەوە هەموو بەجارێك سەرکۆنەی فاتمە خانی قوربەسەریان کرد کە ترساوە بۆیە وای کردووە بەلام لەسەر قسەی باوکم سیٚ پـۆلیسیان لەبـەر دەرگای مالی مام عەولا بەجیٚ هێشتو زەلامەکان گەرانەوە حەوشـەی ئێمەو هەزاران لەعنەتی ئافرەتیان ئەکرد ئێمەش مندالە گەل لەسەر گوی سواندەکەی مالی ئێمە بەرامبەر بـەحەوشـەی مالی مـام عەولا دانیشتبـووین باسی خـۆشی خۆشمان ئەکرد، لەم ئانەدا شلپەیێك لەبن کەپری مالی مام عەولا هات هەموو چاومان لێبوو کە زەلامێکی بۆرەی راست بوەوەو بەرەنگاری دیوار بوو وەکـو بەسەر پێپلکە بکەوێت ئەوها بەسەرکەوت خۆی فرێدایە کۆلانو هەرای کرد لەم ئانەدا پۆلیسەکانی بەردەرگا بە ئاگاهاتنەوە هـەر یەکێکیـان تفەنگی پیٚ بـوو

ئەویش تفەنگێکی پێوەنا، چاومان لیٚ بوو کە رەتێکی برد بەلام نەکەوت خـۆی گرتەوەو وەك ئاسك دەستی کردە گومبەتە خۆی گەیاندە چەم لەم ئانـەدا مام عەولا هاتەوە بەخۆیو ورگی زلیەوە هاواری کرد چی بکەم من لێرە نەبووم دەنا وەللا قورتارم نەدەکرد، پۆلیسێك ووتی «چی، چی؟» مام عەولا ووتی «دەخـوا سەلامەتتکا ناهێلی پیاو هەندێك خۆی لە پێش ژنان هەلبکێشیٚ!!» بەمە خەلکەکە لە قاقای پێکەنینیانـدا.. مان لەمـە ورد ببینەوە کـە ئەم دزە لەکـوێندەر خـۆی شاردبوەوە لە پاشان زانرا کە وەك توورەگە خۆی بە کەپرەکەوە هەلواسیبو، ئەم زەلامانەی کە لە دوای ئەگەران هەر سەیری کونو قوژبنو دەوری خۆیان کردووە کەسیان سەری بەرز نەکردبۆوە کە بیدینی بەم تەرزە ئەم دزە ناپەسندە بە ئەعجوبە لەبەر دەستی دە پانزدە بیست تفەنکچی رزگـار لە زللەو هەتکی

پۆلیس قورتار بوو.

ئەمجارەش هاتینەوە کۆیە، بەلام ئەمجارە لە خانوی خۆمان دانیشتین من زۆر لە کۆیە نەمامەوە چووم بۆ هەولێر کە دەوامی مەکتەب بکەمەوە بەلام زۆری پێ نەچوو لەگەل مالی ئاسەف دووبارە گەرامەوە کۆیە.

ئێستا سالی ١٩٣٢ من لە (کۆیە)م‌و سنفی چواری ئیبتیدائیم‌و عـومرم چواردە سالە دیسان کەوتمەوە ناو رێك‌وپێکی‌و ئینتیزامی ژیـانی مالی بـاوکم، شەرو قیرەقیر نیەو هەروەهاش من ئاگام لەپارەو مەسـرەفی بازار نیـە بەلکـو بەیانیان مەکتەب‌و ئێوارانیش لەگەل کۆنە رەفیقی رانیەم «عوسمان» بە گەران رادەبوێرین. بەراستی ملی خۆم دایە خوێندن لەم سالە لە ئاخیرمانگانی تەدریس شتێك لەهەموو کۆیە روویدا کە بە ژن‌و پیاوەوە پێی هەژان، ئەتوانم بلێم خودا بە رەحمەتی خۆی سەبەبێکی وای بۆ ئیجاد کردم کە من لەم حـادیسەیـە دوور بکەومەوە.

مەوسیمی ئاخەلێوەی بەهار بوو، هەموو قوتابی‌یەك بە حەماسەت خۆیان بۆ ئیمتیحان ئامادە دەکرد تیم‌تیم وەستا بووین هەر تیمە ئێواران لەناو باخچەیەك لە باخچە زۆرەکانی دەوری شار کۆمەلەی ئەبەست‌و بەحەماسەت تێ‌ئەکۆشی ئەو رۆژەی کە حادیسەی تێدا قەوما برادەری زۆر خۆشەویستم لەمـەکتەب «بابەکە»ی حاجی مستەفا لە مەیانی دواندا پێی وتم: «یونس ئەتۆ لە کوێندەر سەعی دەکەی؟» وتم من‌و عوسمان هەردووکمان لە ئاشان سـەعی دەکەین، وتی: «بۆچی نایێت لەگەل من‌و بابە رەسوول‌و سەلاحەددین‌و حەمیدی تاهیر چەلەبی لە رووبار سەعی بکەین؟» جێگایەکی زۆر خۆشمان هەیە چـایەخـانە نزیدیکە هەموو جارێك کە ویستمان ئەنێرین لە چایەخانە چامان بۆ دێت عەسر من‌و سەلاحەددین دێینە دووات پێکەوە ئەچین ئێمە تەئریخمان بەدەستەوەیە تۆش تەئریخ لەگەل خۆت بهێنە، لەسەر ئەمە ئیتفاقمان کرد کە من گەرامەوە مالەوە مەسئەلەکەم بە عوسمـان ووت، عوسمـانیش موافـەقەتی کـرد عەسر قایمەقام خەبەری ناردبوو کە زیارەتی باوکم دێکا، لەبەر ئەمە هەرچەنـدێکی خزمەتکاریش هەبوون کە خزمەتی مەجلیس بکەن بەلام باوکم ئەمری کرد کە من‌و عوسمان خۆمان ون نەکەین من ئەم ئەمرەی باوکم زۆر پێ ناخۆش بوو،بەلام چارەش نەبوو ئەبایە ئیتاعەتی بکەم لەبەر ئەمە ئەو وەختەی کە سەلاحەددین‌و

بابەکە هاتنە دووام زۆر بە شەرمەوە مەسئەلەم تێگەیاندن ئیعتیزارم لێ خواستن بە جێیان هێشتمو ڕۆیشتن، منیش لە پاش ئەوەی قایمەقام هەلسا ڕۆیی کتێبەکەم هەلگرتو چوومەوە کۆنە هەواری جارانم (ئاشان) دەستم کرد بە خوێندنەوە نیو سەعاتی پێ نەچوو گرمەیەك هات زەوی لەراندەوە دووسێ کەسم لەژوور بوون لێم پرسین ئەم گرمەیە چی بوو؟ ووتیان «مومکینە قایەچی بێ بەردی شکاندبێ» فیعلەن قایەچیەکان[١٢] لە نزدیك ئەم شوێنەی کە لێی بووم زۆر جار لە کانگە بەتۆپ بەردیان ئەشکاند بەمە ئیقناعیم هات رووم وەرگێراوە سەر کتێبەکەی دەستم، هێندەی پێ نەچوو عوسمان بە هەرا کردن هات زۆر بە شلەژاوی و مشەوەشیەوە ووتی «یونس هەلسە خێرا باوکت تۆی دەوێ» منیش بەراکردن بەدوای کەوتم لە رێگا لێم پرسی چی قەوماوە؟ ووتی: نازانم ئیتر مەراقم زیادی کرد لەگەل مەراقا راکردنیشم شیدەتی ساند، کە گەیشتمە مالەوە سەیرم کرد لە مالی ئێمە شینە، لەخۆدانە ، گریانە، باوکم لەزاری مزگەوت راوەستابوو پێی ووتم: «یونس لەکوێندەر بوویت؟» زوبانم تێك ئالاو ووتم: «لە ئاشان، لەئاشان» ووتی خێرا بڕۆوە مالێ کە چوومە دیوی ژوورەوە، بە جارێك بەرووما هاتن، دایکم، پورم، مامۆژنم، ئامۆزاکانم براژنم، خوشکم بەجارێك لێیان ئەپرسیم: «لە کوێ بووی، لەکوێ بووی؟» سەرم لێ شێوا بوو، ئارەقە بەدەمو چاوما ئەهاتە خوارەوە وەكو کۆترەیەك کە لە ژوورێکا پشیلە حەپسی بکاتو پەلاماری خواردنی بدات بەم چەشنە موتەفەزیع سەیری دەوری خۆم دەکردو ئەمقیژاند «لە ئاشان بووم سەعیم ئەکرد،چقەوماوە؟ بۆ؟ ئیتر دوو دووو سێ سێ ئەشکی چاویان ئەسریەوە و پێئەکەنین ئەیان ووت (الحمدلله) بەلام فاتم فاتمی خوشکم وەکو شێت لاشعووری خۆی پێ دادام دەستی پێ کرد هەم لێم بدا هەم ماچم بکات، هەم ئەگریا هەم پێئەکەنی، من بەرامبەر ئەم کردەوەیە هێندەی نەمابوو شێت بم دلم شەق با، توورە ببووم بەلام سەرسامیش بووم بەرەکەتدا لەم ئانە عوسمانم بە فریا گەیشت زۆر خێرا مەسئەلەکەی تێگەیاندم کە بابەکەو سەلاحو بابە رەسوولرو حەمیدی تاهیر چەلەبی لە رووبار بۆمبایەکیان لە دەست تەقیوە هەموویان کوژراون.کوژران...مردن..لەگریانمدا رامکردە دەرەوە عوسمانیشم بەدووا کەوت چووینە رووبار دارو بەرد ئینسان بوون، هەموو بەجارێك ئەگریان، ئافرەت شەرمیان نەمابوو بەزریکەو هاوار رایان دەکردە رووبار، هەر دارە مەیت بوو ئەگوێزرایەوە، لەم حەسشاماتە نەمتوانی بزانم کە چەند کەسن بەلام

(١٢) قایەچی : لەکویە بەوکەسانە دەلێن کەبەکاری کیچ دروستکردن هەلدەستن .

ئەمەندەم زانی کە هەر حەمیدی تاهیر چەلەبی ماوە ئەویش بریندارە.

موتەباقیتر هەموویان مردوون گەرامە مالەوە، تا نیوە شەو هەرگریام پاشان بەدەم هەنیسکەی گریانەوە خەوم لێکەوت، پاشی دوو رۆژ چوومە زیارەتی حەمید کە بریندار بوو بۆی گێرامەوە کە خزمەتکارێکی سەلاح بۆمبایەکی لەناو رووبار دۆزیبۆوەو خەبەری دابوونێ ئەوانیش تەدبیریان کردبوو کە هەلیبوەشێنن بارووەدەکەی لێ دەربهێنن، سێ‌چوار رۆژ بوو خەریکی بوون زۆرترین بورغیو بزماریان لێ دەرهێنا بوو، بەلام بورغیەکی گەورە لێیان عاسێ ببوو سەلاح سوێندی خواردبوو کە ئەبێ هەر دەری بهێنێ لەبەر ئەمە هەر ئیسراری لەسەر ئەکرد، پاشان کە مەئیوس ببوو بۆمبایەکەی بە دوو دەست هەلگرتبوو بەقوەت بە بەردێکی زەلامی دادابوو بۆمبا تەقیبوو کەس سەری سەلاحەدینی نەدۆزیبووەوە، بابە رەسوول و بابەکەش وەکو بەبریندار ی هەلیانگرتبوونەوە بۆ شەو مردبوون، دوو مندالی تریش کە بەرخیان ئەشووشت هەردووکیان دەست بەجێ مردبوون. ئیتر بەم سوورەتە ئەم بۆمبایانەی کە ئینگلیز لە پاش حەربی عالەمی یەکەم لەسەر ئەمەی کە کۆیە حاکمی سیاسیان دەرکرد بوو لە حکومەتی ئینگلیزی عادیلە عاسی ببوون، بە کۆیێ دادابوو لە وەختی خۆی فەقێ‌یەک و دوو مریشکی پێ کوژراوە... خانووەهای پێ وێران کردبوو، بەلێ ئەم بۆمبایەش لەم بۆمبایانەبوو کە لە رووبارەکە ئەوساکە نەتەقی بوو بەلام لەپاش دە سال لە مەوسیمێکی کە دار بەری ئەدا گول ئەپشکوت ژیان تازە ئەبۆوە داری پێنج لاوی تازە هەلچووی بڕی گولی جوانی هەلوەراندن چرای ژیانی کوژاندەوە.



ئێستا من لە سالی ١٩٢٢م سنفی پێنجی ئیبتیدائیم، لەم سالە مەجرای ژیانم گۆڕا، لە دەوری مندالی هاتمە دەورێکی ترکە ئیتزانێکم پێ وەرگرتبوو لەم سالەدا:

١ ـ دەستم پێکرد بە وردی دیوانی حاجی قادری کۆیی موتالەعە بکەم بەلکو شیعرەکانیم ئەغلەب لەبەر کردبوو، دیسان مام کە زۆر بە وردی گوێ لە شیعرو قەسائیدی شاعیرانی کۆی وەکو (عەونی، راجی، عاسی، حسێنی) رابگرمو



دڵدار لە پۆلی سێیەم
سەرەتاییدا

لەبەریان بکەم بەمەش ئیکتیفام نەدەکرد هەر شیعرێکی کوردیم بکەوتایە بەرچاو ئەمنووسی یەوەو لەبەرم دەکرد تا ئەغلەب شیعرەکانی وەفایی (کوردی، بێکەس، زیوەر، پیرەمێرد)م لەبەر کرد زۆرم لا خۆش بوو کە بەیانیان حەمە رەش و غەریب موستەفا لەمەکتەب ئەهاتنە دەرەوە بە حەماسەوە شیعری (ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم)ی بێکەسیان ئەخوێندەوە لەم سالەدا بەرە بەرە هەستم بەخۆم دەکرد لەزەت لە شیعر وەرئەگرم بەلکو زۆرم لاخۆشە.

٢ - عەبدولکەریم سەید ئەحمەد[١١] کە بە خزمایەتی ئەگەیشتە مە بووە رەفیقم عەبدول کەریم بە سێ چوار سال لەمن گەورەتر بوو کوڕێك بوو زۆر رای لە خۆ بوو خەیالێکی واسیعی هەبوو، باوکی سەید ئەحمەد لە شاعیرەکانی کۆیە ئەژمێردرا بە (حسێنی) ناسرابوو بەلام لەبەروەی چونکە ئەشعاری وەتەنی نەبوو کەس ناوی نەدەبرد، لە ئەو ساتی غەیری گەنجەکانیشدا لەبەر فەقیری ئیهمال کرابوو بەلام (حسێنی) وەنەبێ زۆر باکی بەو ئیهمال کردنە بووبێ بەلکو ئەم لە دونیای خۆیدا دونیای فەقیری و ئەدەب زۆر قانیع و رووخۆش ئەژیا، بابە شێخ زۆر رەفیقی (عومەر عەبدوللاو ئەحمەدی حەمە مەلاو عەونی شاعیر بوو) بەتەبیعەتی حال منیش تێکەلی ئەم تیپە بووم زۆری پێ نەچوو کە لەگەلیان بوومە رەفیق، عەونی لەبازار بەقال بوو لاوێکی قەدە بالای رەنگ گەنمی چاو رەشی چاو گەورە لووتێکی بەکەوانەی ناوەندی بەسەر دوو لێوی تێك قرمساوی باریکا هاتبوە خوارەوە، زۆر کەم قسەی دەکرد، بەلام ئەغلەب قسەکانیشی نوکتەو حیکایەتی عیبرەت ئامێز بوو، وەستا عەبدللای ئامۆزای ئاسنگر بوو نەیدەزانی بخوێنێ و بنووسێ، بەلام لە عەقل و رەئی و تەدبیردا هەموو لایەك ئیعتمادیان لەسەر ئەکرد، عومەر کوڕێکی سوورەی موو زەردی چاوکالی بە شەوکەت بوو زۆر بە قاقا پێدەکەنی روحێکی گوشاد دەنگێکی خۆش دلێکی بێ گەردی پاك بەراستی میر کورانی ئیحراز کردبوو، ئەحمەد کوڕێکی باریکەلەی زەردی چاوگەورەی لوت خڕ بەلام نێوچەوانێکی پان، هەیکەلێکی جوانی هەبوو زۆر دەنگی خۆش بوو زۆریش تەفەنونی لە شەدە بەستن دەکرد چاو لەدەر بوو دۆستداری و عەشقبازی ئەکرد، بەراستی مێبازی بە ئیرس بۆ مابۆوە بەلام لە سەعی نەکردن چاوم لەوان نەدەکرد بەلکو بەتەنها لەمالەوە زۆر سەعیم ئەکرد لەم تەئریخە لەگەل ئەم برادەرانە فێری جگەرەکێشان بووم بەلام لە مالەوە بێجگە لە خوشکم زیاتر کەس نەیئەزانی کەمن جگەرە ئەکێشم.

٣ - جاروبار هات و چۆی مزگەوتم دەکرد، فەقێیەکانی مزگەوت زۆر حورمەتیان ئەگرتم، جارجاریش لەسەر ئەمە موجادەلەیان لەگەل دەکردم، کە بۆچی نوێژ ناکەم؟ بە کافر ئیتیهامیان دەکردم بە جەهەنەم تەهدیدیان دەکردم بەلام من زۆر بەتوندی جوابم ئەدانەوە تا وای لێ ئەهات کە پێیان بلێم (ئێوە عیبادەتی ئەوهام دەکەن وە یا بلێم «وەرن تێم بگەیێنن کە دین چیە؟» لەسەر ئەمە دوورو درێژ ئەکەوتینە موجادەلە ئەم موجادەلەیەی من و هجوومی ئەوان رەدی فعلێکی لە نەفسمدا ئیجاد کرد، کە تووشی شکوك هاتم وەشکەکەشم ئەمەبوو خودا چیە؟ زۆر چاکم لەیادە کە جارێکیان بە منداڵی لە دایکم پرسی بوو: تۆ بۆنوێژ ئەکەیت؟ ووتی: «بۆ خوا کورم» پێم ووت «خوا لە کوێندەرە...؟» ووتی «لە هەموو شوێنێکە، نازانم» گریام ووتم نیشانم بدە خوام دەوێ» ئیتر زللەیێکی لێدام ئەم زللەیە هاوێشتمیە سەر ئەمە کە خوا بە شتی بە ترس بە ترس بهێنمە پێش چاوی خۆم دیسان لەبیرمە لە رانیە جارێك مەلا حەوێز ئەفەندی (معەلیم) دەرسی دینی پێ ئەوتین لێم پرسی: مامۆستا خوا چۆنە؟ جوابی دامەوە: خوا چ رەنگێکی نیە، جیسمی نیە، بە هیچ ناچێ بەلام هەیە ئەبیسێ گوێی نیە، ئەبینێ چاوی نیە، ئەدوێ زبانی نیە تێگەیشتی؟ ووتم: «چۆن جیسمی نیە، بەلام هەیە؟ کەوابوو نیە.» لەسەر ئەمە چوار داری لە دەستی دام ئەو دارانەی مەلا حەوێزە ئەفەندی وەك زللەکەی دایکم ئەم سوئالە رەهیەی لە مێشکدا نیشتمەوە ئەم جارە لەگەل ئەم فەقێیانەی کە موجادەلەم دەکرد ئەم رەدی فیعلەی کە لە نەفسمدا هاتبووە وجوود هەرگیزنەمئەویست کە بە تەنها لەم حیرەتە بمێنمەوە بەلکو (ئینتیقامەن وە ئیستیهزائەن) بە نەزانینیان پێم ئەووتن «ئەگەر راستە خوا دەناسن خوام پێ بناسێنن، ئەم تەکلیفە زۆر جاران ئەوانی ئەهاوێشتە سەر ئەمە کە لە دائیرەی سوورەتی « قل هو الله احد »دا تەعریفی خوام بۆ بکەن، بەلام من جوابم ئەدانەوە (کێ ئەلێ ئەمە وایە) ئەیان ووت: خوا دەفەرموێ .. ئەمووت «کێ گوێی لێ بوو کە ئەمەی فەرموو..؟» ئەیان ووت: «تەبیعی پێغەمبەر» ئەمووت: کێ گوێی لێ بوو لەگەل پێغەمبەردا کە خوا ئەمەی پێ فەرموو..؟ ئەیان ووت عەجاییب ئەمە وەحی‌یە هەر بۆ زاتی موبارەکی پێغەمبەر هاتۆتە خوارەوە کەسی تر گوێی لێ نابێ. ئەمووت: چ مەعلووم کە ئەم تەعریفە هەر پێغەمبەر خۆی داینەناوە، وە ئەویش وەکو ئێوە خوای نەناسیوە..؟، بەمە زوبانیان ئەبەسترا توورە ئەبوون ئەیان ووت: «هێشتا تۆ جاهیلیت، هێشتا نلتوانی ئیعرابی «ضرب عمرو زیدا» بکەی

چۆن ئەتوانی کە پێغەمبەر بە خوانەناس ئیتیهام بکەی؟! ئەمووت باشە توورە مەبن، من کوردم عەرەبی نازانم چ عەیبی تێدا نیە کە نەزانم «ضرب عمرو زیدا» چۆن ئیعراب ئەدرێ بەڵام ئێوە ئیسلامن وخوا ناناسن، ئەمە عەیبە! لەسەرئەمە بارەها تێك ئەچووین لەلایان ئەهاتمە دەرەوە ئەوان منیان بە (مولحید) منیش ئەوانم بە جاهیل ودرۆزن ئیتیهام ئەکرد... عوسمان سەعید چوو بۆ رەواندوز من زۆرم کرد کە باوکی لە کۆیە بە جێی بهێڵێ بەڵام هەرچەندێکی خۆی رازی بوو ئەما باوکی مومانەعەتی نیشاندا، بەمە لێك تەفریق بووین. ئێستا وا لە سالی ١٩٣٤ چوومە سنفی شەشەم.

١ - برادەرەکانی مەکتەبم: عومەر عەبدوللاو ئەحمەد عەبدولکەریم، ئەحمەد هەرسێکیان لە (بەکەلۆریا) راسیب بوون و مەکتەبیان تەرك کرد دەوری ئێمە لە دەوری پێشە خۆمان مندالتر بووین لەبەر ئەمە ئیدارەی مەکتەب بەهەموو وەسیلەیەکەوە تەشجیعی ئەمەی ئەکردین، کە موتەسیل سەعی بکەین ناوی کۆیە لەناو ناواندا زیندو بکەینەوە، دوو سێ سال بوو مەکتەبی کۆیە لە ئیمتیحاناتی وزاریدا (بەکەلۆریا) یا یەك ناجیح یا دوو ئیکمال هەبوو بەس.

تەشجیعی هەیئەتی مودەرسین ئێمەی بەناز کردبوو وە نازەکەشمان قبوول دەکرا، هەموو لایەکمان تووشی غرورێك هاتبووین. ئەم غرورە سەوقی ئەکردینە سەر ئەمەی کە رقە لەگەڵ یەکتر بکەین حەقیقەتەن لە سنفدا زۆر موتەنافیسی یەکتر بووین و موعەلیمەکانیش ئەم مونافەسەیان لا خۆش بوو.

٢ - ئاخیری سال هات، حەفتەیەك لە پێش ئیمتیحان (زەکی ئەفەندی) کە موعەلیمی تەئریخ بوو هاتە ژوورەوە موجەلەیێکی (الهلال)ی میسری بە دەستەوە بوو، هەروەکو جاران وەکو ئەسکەندەرنامە بخوێنێتەوە بەم سوورەتە بە ئیشارەت و بە دەنگ، خولاسەی (دوەلی مەمالیکی) بۆ تەقریر کردین لەپاشان ووتی لەم موجەلەیەدا (فال نامە) هەیە فالتان بۆ بگرمەوە بزانن موستەقبەلتان چۆنە؟ ئەمری کرد یەکێکمان بەراکردن چوو لە بازار هەندێکی برنج هێنا ئیتر لە دەوری کۆبووینەوە، یەك یەك چاومان ئەنوقاند بە سێ ئەموست هەندێك برنجمان هەڵئەگرت لەپاشان دانەکانیمان ئەژمارد کام رەقەمی بگرتایەوە، (زەکی ئەفەندی)، سەیری ئەم رەقەمەی ئەکرد ئیتر هەر کەسە جوملەیێکی خۆش وە ناخۆش بەری دەکەوت. نۆبەی من هات منیش رەقەمێکم ئیجاد کرد سەیری

رەقەمی کردم ووتی (لایمکن ان تنجح في الحیاة لأنك ترید ان تقتل عصفورین بحجر واحد، فیطیران منك وترجع انت بخفی حنین) بەمە رەفیقەکانم لە پێکەنینیاندا، من چاوم پڕ بوو لە ئاو بەڵام خێرا دەستم درێژ کردە پەنجەرەکەی پشتەوەم قورئانێکم هێنا زۆر بە تەهەورەوە سوێندم خوارد کە مومکین نیە ئەبێ من هەر ناجیح بم وە لە حەیات سەربکەوم لەسەر ئەمە زەکی ئەفەندی رووی وەرگێڕایە قوتابیەکان ووتی «فال درۆیە، هەرکەسێ عەزمی هەبێ ئەو ناجیح دەبێ» ئینجا پێی زانی کە لە وەختێکی ئەوها ناسکدا شتی وا هێنانە مەکتەب و قوتابی بەرەو خرافات راوندن چەند غەلەتە.

٣ - لە عەینی رۆژدا معەلیمی کیمیا (فەخری ئەفەندی سامی) سنفی شەشی کۆ کردەوەو ووتی «ئینشا ئەللا سالێکیتر دەموچاوتان لەم سنفە نابینم، لام محەقەقە کە زۆرترینتان دەرئەچن و دەکەونە شاران هەندێکتان دەخوێنیتەوە، هەندێکیشتان مل ئەداتە لایێکی تر لەبەر ئەمە بە پێویستم زانی کە ئیمرۆکە ئاخیر جار کۆتان بکەمەوە رازو گلەیی لە یەکتر بکەین با دلمان لە یەکتر نەمێنێ، لە هەموو شتێك خۆشتر زکرەیاتی خۆشە، من گلەیم لە هیچ کامتان نیە هەمووتان ساعی و بە ئەخلاقن وە تێکەیشتوون ، ئەگەر دلی هەر کامێکتانم شکاندبێ لەسەر

مەسلەحەت و قازانجی ئەو کەسە بووە وە لە قەراری دلی خۆمدا لەم تەهەورەی خۆم زۆر پەشیوان بوومەوە.

برایانم: ئێوە ئینشائەللا دەرئەچن و ئەکەونە حەیاتی تەحسیلەوە بەڵام حەز دەکەم کە ژیانتان تێبگەیێنم، ژیانی تەحسیل وەك ئاوێنەیەك وایە کە ژیانی حەقیقی تێدا دیارە، بەڵام ژیانی حەقیقی وەك موسابەقەی ریازە وایە ئەوی چاك تەمرینی کردبێ و نەترسێ ئەو کەسە هونەر ئەباتەوە ئەبێ ئێوە تەمرین زۆر بکەن تەحسیلی ئیهتیدائی موقەدیمەیەکی زۆر بەسیتی عیلمە ، ئەبێ تەمرین زۆر بکەن و سەیری ئەم ئاوێنەیەش بکەن کێ چۆن پێشکەوتووە ئێوەش خاسیەتی ئەو بگرن . مەترسن ترسان گەلێ شت لە دەست ئینسان ئەدا، ئێوە ئەچنە شاران ئەنواعی دەم و چاو ئەبینن ، ئەنواعی تەبائیع و ئەخلاقتان تووش ئەبێ و ئەنواعی جەمعیاتان تووش ئەبێ.

مەترسن مودا خەلە بکەن تەشریکی مەساعیان لەگەل بکەن بەڵام ویجدانی خۆتان موعەزەب مەکەن هەر ئیشێکی کە کردتان سەیری ویجدانتان

بکەن ، ئەگەر موعەزەب بوونەمە گەورەترین جەزایە ئەگەر مەسعوود بوو ، ئەمە بەقیمەترین موکافاتە ، ئیتر ئێستا یەك یەك بێن موسافەحەم لەگەل بکەن و خوداحافیزتان بێ ، یەك یەك هەلساین دەستیمان گوشی ئەویش بە روومان پێئەکەنی بە چاوێك کە هەموو برایەتی و خۆشەویستی بوو ، لێمان ورد ئەبۆوە فەخری ئەفەندی هێشتالە ژوورەوە بوو کەمەلا عەبدولڕەحمان ئەفەندی مودیر هات ئێمەی دووبارە خستەوە سنف، لەبەر دەممان راوەستا وتی «پاش نیوەرۆ هەمووتان وەرنە مەکتەب لە لای من چا بخۆنەوە و تەعلیماتی ئیمتیحانیش وەربگرن».

پاش نیوەرۆ کە هاتینەوە لە حەوشەی مەکتەب فەقێ مەحموودی فەراش سەماوەرێکی گەورەی لەبەر دەمی خۆی دانابوو ، تەخت و کورسیش ریز کرابوون ئیتر مودیرە ئەفەندی لەناومانا ئەهات و ئەچوو جغارەی دایە جغارەکێشەکان لەپاش ئەوەی کە گەلێك نەسیحەتی کردین کە قۆپیە نەکەین وتی «چ ئیحتیاجی نەسیحەت ناکات هەروەکو بۆ ئیدارە مەعلووم بووە دەورەی ئیمسال زۆر لەدەورەکانی رابردوو باشترە ، ئومێدیش وایەکەدەورەی سالی ئاتی لەدەورەی ئێوە باشتر بێ.

---

## سالی ١٩٣٥

---

لە پاش ئەوەی کە هاوینێکی زۆر خۆشم لە «مەلا زیاد» رابوارد لەم هاوینەدا ببوومە کاتبی مەزرەعەی توتنی خۆمان لەگەل عومەری عەلیە گۆج ناو کە توتنەوان بوو زۆر بە کەیف و تەشقەلە رامبوارد، گەرامەوە کۆیە باوکم ئاسەف وتیان کە ئەبێ بچم بۆ هەولێر لەوێ لە سانەوی بخوێنم ، ئیتر ئوتۆمبیلم گرت چوومە هەولێر لەوێندەرێش بۆ سیاحەت چوومە کەرکووك مالی کاکەم حەمید ، کە ئەوساکە بە هیەی کچی خالمی گواستبوەوە ، چووم لە مالی بەهیە میوان بووم ، زۆر خزمەتیان کردم کە مەکتەب کرایەوە حەمید هەموو کتێبی سنفی یەکەمی متەوەسیتەوە قاتێك ئەلبیسەی جوانی بۆ کردم ناردمیەوە هەولێر ، کە مەکتەب کرایەوە چوومە متەوەسیتە ، خۆم لە سنفی یەکەم تەسجیل کرد.

١ ـ دیسان گەڕامەوە ناو شەڕو هەللای بـراژنم و کاکـەم سەعـدی ، جاران شەریان لەگەڵ یەکتر دەکرد لەسەر ناگزوری ئێستا شەڕەکەیان ئەغلەب لەسەر ئەحواڵی کچەکانیەتی کە یەکێکیان لە کەرکووك ژنی کاکەم حەمید ، ئەویتریان ژنی کاکەم ئاسەف بوو ، بەلام من هەروەکو تاکە هۆدەکەی سەر کۆشکم ئیشغال کردبوو ، ئەوها دوور ئەوێستام جار جار بە ووتاری نەرم نەرم هەردوولام سارد دەکردنەوە ، ئەم مەوقیفەی من ، کە کۆترەی ئاشتی بووم ، زۆر جار وا ئەبو ، ساچمەی شەرم بەسەرو گوێلاك ئەکەوت ، ئەمما زۆری پێ نەئەچوو هەردوولا بەرامبەر من پەشیمان ئەبوونەوە زۆر جاریش وا ئەبوو کـە بەسـەر ناکـۆکی بەدفەردا موەفەق ئەبووم ، مودەتی سێ چوار رۆژ لە ماڵەکە دەرم ئەپەراند .

٢ ـ برادەرەکانی مەکتەبی شوعبەم هەموو هاتبوونـە متەوەسیتـە بێجگە لە نازیرەکەکان نەبێ ، کە لەبەر سقوت کردنیان مەکتەبیان تەرك فـەرمووبـوو ، هەندێکیان ببوونە پۆلیس هەندێکیشیان بێ ئیش لە هەولێر ئەسوڕانەوە ، زۆر لەسەر شەقام تووشی یەکتر ئەبووین زۆر بە ئیحتیرامەوە سەلاممان لە یەکتر ئەکرد . ئێمە قوتابیە غەریبەکان ،کۆیی و شەقلاوەیی و رواندوزی لە هەولێر بە عینایەتێکی تایبەتی معامەلەیان لەگەڵ ئەکرا وە بە چاوێکی زۆر موقەدەر سەیر دەکراین ،کەس رقی لە ئێمە نەئەبۆوە ، بەلکو (بالعکس) محەبەتمان ئەتوانم بلێم لە دڵی هەموو هەولێریـەك هەبـوو ، چونکـە وایان ئـەزانی بەراستی کـوردین مەسدەری وەتەنی یەت و حەماسەت نموونەی کورد زوبانێکی فەعالین ، لەبەر ئەمە قوتابی یە هەولێریەکان زۆر خۆیان لێ نەزدیك ئەکردینەوە ، زۆر بە ئینتیباهو حەماسێکەوە گوێیان لە شیعرە حەماسیەکانی (عەونی، دلاوەربێ کەس، زیوەر، ئەحمەد بەگ،)رائەگرت کە بۆمان ئەخوێندنەوە لەپاش نیوەڕۆیان لە چایخانەی مەگردیچ کە هەم مەکتەبەو هـەم چایخـانەیـەك بوو کـە تایبـەتی قوتـابی لێ دائـەنیشتن ، لەم چایخـانەیـە بە (مسـامرات) و خـۆشی بەشـەویش لە ماڵی قوتابیەکانی کۆیی کە لەگەڵ شەقـلاوەیی و رواندوزیـەکان مـوشتەرەکـەن لە محەلەی عارەب خانوێیکیان گرتبـوو، بە گـۆرانی و ئەشعـاری وەتەنی رامـان ئەبوارد ئەغلەب شەوانی جومعە تـا درەنگ دائـەنیشتین ، لە هـەولێریـەکان خاسەتەن (فەتاح جەبار) کە بە خەسرەو مەشهـور بوو وە (جـەلال قادر) وە (مستەفا محەمەد) وە (برهان محەمەد) کە بە جاهید مولەقەب بوو ، ئەمانە دەمو سـات لەگەڵـان بوون، فـەتاح خـەسرەو کـورێکی چوارشـانەی بـالا بەرزی

ئەسمەری، دەست و پەل ئەستوری شەڕانی بوو، زۆر بەو شەخسیەتانە ئەچوو کە لە سینەما نیشان ئەدرێ، شەڕانی بەڵام دەم بە پێکەنین ، ڕاست، زۆر جوامێر بوو ، تەقریبەن هەموو قوتابیە کانی هەولێری لە شەق و قسەی ئەترسان ، نەیان ئەتوانی کە لە ووتاری دەربچن، خەسرەو بە نیشتمان پەروەرێکی (متطرف ـ موتەتەریف) ئەناسرا، وە یەك لەم کەسانە بوو کە قیادەی ئەم موزاهەرەیەی کردبوو، کە لە ساڵی ١٩٣٢دا بەرامبەر بە حکومەت نیشانیان دابوو ، زۆر جاران کە لە مەکتەبەی مگردیچ دائەنیشتین وە ئەکەوتینە باسی دوورو قوول ، گەر یەکێکی ناجائیز بهاتبایە خێرا مگردیچ ئەفەندی بەلامانەوە ئەهات بەدەنگێکی هێواشەوە ئەیووت «کونشمەین» یەعنی «مەدوێن» مگردیچ ئەفەندی ئەرمەنیەکی بەناو سالان کەوتو پیاوێکی باریکەلەی سپی ، چاو شین ، روو چرچ، قژ سپی، زۆر پاك و خاوێن بوو، بەڕاستی زۆر قوتابیە کوردەکانی خۆش دەویست، ئێمەش زۆر حورمەتی ویمان ئەگرت.

٣ ـ زۆرم حەز دەکرد کە سعاتەها لەگەڵ جاهیدا[١١] پێکەوە دابنیشین باس لە شیعرو ئەدەبیات بکەین ، ئەو هەروەکو (جەبار ئاغا کانی) کە مامی جاهید بوو ، شاعیرێکی موناسیب بوو ، شیعری زۆر تەڕ و غەزەلیاتی زۆر گەرمی خۆی وکانی بۆ ئەخویندمەوە ، منیش ئەشعاری غەرامی شاعیرە مەشهوورەکانم بۆ دەخوێندەوە ، جاهید کوڕێکی بەشەوکەتی دەم بەپێکەنینی شۆخ بوو ، هەڵستان و دانیشتنی زیندەگی و گەنجایەتی ئەبەخشی ، بە ئەلبیسەی زور جوان و پارەیکی زۆرەوە هەتا لەدەستی بهاتبایە خۆی لە لەزەت و سەفاهەت دوور نەئەکردەوە ئێمە تەبیعی هەر هەڤاڵی چایەخانەی مگردیچ بووین و بەس ، زۆر جاران نەسیحەتم ئەکرد کە جەوهەری ئەدەبی خۆی بەم سەفاهەتە نەکوژێنتەوە ، ئەدەب بەبێ سەقافەت چ قیمەتی نیە ، رووبەداتە خوێندن . هەروەکو جاهید لە مەکتەبدا سنفێك لە پێش منەوە بوو لە ئەدەبدا پایەکی بەرزی وەرگرتبوو ، زۆر ئەم ووتارانەی منی لا مەرغوب نەبوو بەلکو ئەیووت «حەیات فورەسەتێکە زۆر بەقیمەتە بەخەفەت و مێشك مەشغوول کردن لەدەست خۆمانی بدەین جارێکتر ئەم حەیاتەمان بۆناگەرێتەوە ، کە بەرەندو خراباتی تکراری بکەینەوە ، حەقیقەت ئەمەیە کە منی تێدام دونیای من ئەم دونیایەیە کە خودا لە قورئاندا سۆفی و مەلاو شێخەکانی پێ هەلخەلەتاندووە ئەویش : مەی ، کچی

جوان ، شیعری خۆش ، کەیف خۆشیە ئەمەی ئەووت و بەرووما پیٚ ئەکەنی بەلام من وەنەبیٚ ووشە گەرمە بەتینەکانی (جاهید) زۆرم تەئسیر تیٚبکات ، بەلکو (بالعکس) بە یەکیٚکم دائەنا کە خۆی بەدەستی خۆی ئەکوژیٚ و ئاگری زیرەکی و جەوهەری ئەدەبی خۆی ئەکوژیٚنیٚتەوە ، زۆرم پەرۆش بوو کە بەم تەرزە ئەم لاوە بەرەو کەوتن ، بەرەو سووك بوون بەرەو تاریکی بروات ، لە گەلیٚك موناقەشات و ووتاری بەینی خۆماندا ، هەستم بەخۆم دەکرد کە هیچ نازانم زوو تیٚگەیشتم کە خویندنی مەکتەب و دەرسەکانی زانینەکەی لەوانە نیە گۆی موجادەلەیکی بیٚ بەریەوە لەبەرئەمە زۆر بە حەماسەتەوە لە کتیٚبخانەی کاکەم سەعدی دەستم پیٚکرد کە موتالەعات بکەم ، لە پیٚش هەموو شتیٚکا ، تەئریخی سەورەی فرانسە و تەئریخی یونانم بە تورکی موتالەعە کرد ، لە پاشان تەئریخی ئیستیقبالی جەلال نوری مەشهوورم هەرسیٚ جوزء تەدقیق و خویندنەوە و تەئریخی کوردو کوردستانی ئەمین زەکی بەگ و تەئریخی بابان و سۆران و موکریانی سەید حسین حوزنیم بە کوردی خویٚندەوە . ئەمانە هەمووی دروشمی رابوودوویان هیٚنامە بەرچاو ، لەگەلٚ خۆم زۆر موجادەلەم ئەکرد ، مام بەرەبەرە میٚشکم بکەمەوە ، تەقدیری تەئریخ و تەنفیذی بکەم .

لەم تەئریخە بوو کە دیوانی نالیم زۆر بە وردی خویٚندەوە ، شیعرە جوانەکانی نالی لەگەل شیعرە ئاگرینەکانی حاجی قادر لە میٚشکمدا لەسەر زەعامەتی ئەدەبی شەریان بوو ، لەم شەرە شتیٚکیان بەمن بەخشی ، ئەویش بۆ شیعرو ئەدەبیات رواندمیان ، زۆر خەیالی وام لە میشکدا بوو کە حەزم دەکرد بە ناو خەلقیدا بەرهایان بکەم خۆم ئیمتیحان کرد کە ئەتوانم شیعر دابنیٚم شەویٚکیان تا درەنگ نەنووستم قەسیدەیکی پانزدە بەیتیم دانا ، کە تەسەووری دایکیکم تیٚدا کردبوو ، بۆ رۆلە لە سەورە کوژراوەکەی چۆن ئەگریا ! ئەمە یەکەم شیعر بوو کە دامناوە ، ئیٚستا تی ئەگەم ، ئایا بۆچی قەسیدەیٚکم لەسەر تیلابنی چاوی کچیٚکی جوان دانەنا ؟ ئایا ئیحساسم نەبوو ؟ یان لاو نەبووم .. ؟ بەلیٚ هەم ئیحساس و هەم گەنجایەتیم هەبوو ، بەلام نالی کە بۆ دلداری رای ئەکیٚشام و حاجی قادر کە بۆ نیشتمان پەروەری رای ئەکیٚشام ئەم دوو شا شاعیرانە هەردووکیان جیاجیا تەئسیری خۆیان لە دلم کردبوو ، بەلام موتالەعاتی تەئریخم و موحیتە ئاگرینەکەم و نەفسیەتی بۆ خزمەت تیٚنوم ئەمانە هەرسیٚکیان منیان بە لای (حاجی) دادا هەر کە ئەمویست غەزەلیٚکی غەرامی بلیٚم دەنگی پیرۆزی حاجی

بەسەریدا ئەقیژاندم و ئەی فەرموو :

باسی زولفی دریژو چاوی بەخەو
نەبڕاوە بووە تری خەسرەو

ئیتر دەستم لە قەلەم شل دەکرد مەجرای تەفکیرم ئەگۆڕاند . من لە هەولێر هەر شیعرێکم کە دائەنا ، نیشانی جاهیدم ئەدا ، ئەویش زۆر نازکانە بۆی تەسحیح ئەکردم ئەمە لەنگە ، ئەم کەلیمە بە قافیە نیە ، ئەم ووتارە زەعیفە ، ئەوهابی باشترە ئەم بەیتە لەگەڵ هینەکەی پێشەخۆی لە وەزندا جیاوازن ئیتر بەم سوورەتە چەوت و چێلی شیعرەکانمی راست ئەکردەوە ، لە پاشان دەستی ئەگوشیم و ئەیووت «تەبریکت ئەکەم» رۆژ بە رۆژ بەرەو تەکامول ئەڕۆیت ، تۆ لە موستەقبەلدا ئەبیە شاعیرێکی باش ئەم تەشجیعەی جاهید رۆژ بە رۆژ مێشکی ئەکردمەوە مەراقی شیعر ووتنی زیاد ئەکردم . لە مەکتەبی متەوەسیتە موراقیبی عام کە ناوی (عەلی حوسین ...) بوو لە لایەن (خورشید سەعید)ی مودیر دانرابوو بە جاسوس لەسەر ئێمە ، ئێمەش ئەم وەزیفە موبارەکەی (عەلی) مان بە تەجاوزو تەحقیر کردنی تەقدیر دەکرد ، بەرامبەر ئەمە خۆی پێرانەئەگیرا ، ئەچوو لەلای مودیر شکایەتی لێ ئەکردین مودیری مەکتەبیش هەر رۆژە چەشنە تەکبیرێک و چەشنە بەهانەیێکی پێ ئەگرتین بەم حالە رامانبوارد ، تا ئیمتیحانی نیهائیماندا ، ئەو رۆژەی کە نەتیجەی ئیمتیحانمان وەرگرت لەچاپەخانەی مکردیج زۆر خراپمان لەیەکتردا ، ئەو خۆیوچەند خزمێکی بوو، ئێمەش حەفت کەس بووین ، شەر کەوتە سەر جادە هەر دەست بوو رائەوەشا ، کە بەرد بوو تێ ئەگیرا ، هەر دار بوو ئەوەشێنرا ، بەم چەشنە شەر ساعەتێک دەوامی کرد ، تا قوەتێکی کافی لە پۆلیس هاتن ئێمەیان بردە مەرکەزی پۆلیس ، لەوێندەر کەفالەتیان لە هەموو لایێک وەرگرت و بەرەللایان کردین ، سبەی هەر لە دائیرەی پۆلیس سولحیان پێ کردین ، قەزیەیان سەدکرد .

لەم ساڵە لە هاوین لە پێش وەی کە بچمەوە کۆیە ، مانگێک بۆ رابواردن چوومە گوندی (تیمار) کە سێ کیلومەتر لە هەولێر دوور بوو وە مولکی سەعیدی سەید عومەر ئاغای زاوام بوو لەوێندەر لەگەڵ فەلاحەکان زۆر زۆر یەکترمان خۆشویست . فەلاح ـ کرمانجەتی ـ وەکو منداڵێک وایە هەرکەسێکی کە بەڕووی زۆر پێبکەنی و بیلاوێنیتەوە خۆی بە ئاسودەیی ئەهاوێتە باوەش و بەسەهلی کلیلی

دڵی خۆیت ئەداتێ ، هێندەی بێ ناچی کە لە تەکتەوە دائەنیشی داخی دڵی خۆیت بۆ هەڵ ئەرێژێ‌و باسی ناگزوری خۆیانت بۆ ئەکات بەلام هەر ڕێگەیکی کە بۆ ئازادی‌و لەم کۆتە رزگار بوونت کە نیشاندا خێرا سەرت بۆ ئەلەقێنی‌و بەقسەت ناکات زۆر لە ئاغا ئەترسن زراویان لە مەلا چووە لەگەڵ ئەوەشا ئەگەر بزانن ئاغاکەیان لە حکومەت زەعیفەو بێدەستەلاتە بەهەموو وەسیلەیێکەوە دزی‌و بەهەموو ڕیگاییکەوە دروزنی لەگەل ئەکەن ، ئەگەر بشزانن کە مەلا لای ئاغا مەرغوب نیە ئەیکەنە قەشمەر جاری خۆیان ، ئەمما (شێخ) لای کرمانج فەوقی هەموو شتێکە ، شێخێك ئەتوانی زۆر بەسەهلی شەوکەتی ئاغا بشکێنێ ، بەلام ناتوانی سولتەی ئاغا وەربگرێ .

زۆر جار (مەلا هەمزەی) موختار کە لە وەختی خۆیدا سیپارەی خوێندبوو ، بەتەنها کە ئەیتوانی حروف لێك بکاتەوە لەقەبی مەلایەتی ئیحراز کردبوو ، وە تەمیزێکی عەقلی‌و تەدبیری بێهەمتای لەچاو ئەوانی ترا بە خۆشك ئەبرد ، بەڵێ زۆرجار ئەم مەلا هەمزەیە لام دائەینشت لە پاش ئەوەی کە دووسێ پارت دامەمان ئەکرد ، ئەو باسی غەدرو زۆرداری ئاغا و من باسی بێدەستەلاتی وبێ پەیمانی خۆیانمان بۆ یەکتر ئەکرد ، هەستم بەمە کردبوو کە بەس مەلا هەمزە لە ووتارەکانم دەگات ، وە هەر مەلا هەمزەشە گەر بیەوێ لەم گوندە زەلامە کە (١٥٠) ماڵە بتوانی کە شعورێك فرێ بداتە ناو کرمانجەکان ، بەلام ئەمەندە بێباوەر بوو ، کە پشتی بە برای خۆی نەئەبەست وە بە سێبەری خۆی بروا نەدەکرد کە سێبەرە ، ئەم بێباوەڕیە خاسیەتێکە کە لەناو میللەتی جاهیلدا گەورەترین میکرۆبە لە لەشدا ، لە خوێنی ئەم لەشەدا ئەژی .

لە شەخسی بێ پێچەوانەی کرمانجدا زور شت ئەبینرێ گەر بە وردی لێی وردبی‌یەوە زۆر شتی لێ ئیستینتاج ئەکرێ لەپێش هەموو شتێکا ئەبێ لەگەڵ کرمانجدا زۆر واقیعی بی چونکە بێجگە لەمەی کەئەیبینی‌و بێجگە لەمەی کە ئەیبیسی چیتر لە ژیان نازانی ، چونکە نەخوێندەوارو هیچ نەزانن لە ژیاندا هێشتا لە دەوری زراعیدا ئەژین‌و زۆر مەربووتی زەوی‌و خرافات‌و زگی خۆیانن هیچ وەختێك ئەمەلی وەعی لێی ناکرێت ، وە بە چاوی مەسلەحەی عامە سەیری هیچ شتێك ناکەن ، ئەم سەبەبە کافیە کە تەبیعەتی چوار پێیان هەبێ[٢٠] بێجگە لە تەهدید نەبێ لەهیچیتر ناترسێن بەلکو تەهدیدی بێ تەنفیذ لەنەزەر دەشتەکیدا

چەشنە درۆیەك و خۆهەلكیشانێكە كە پیاوی زوو پێ سووك دەبێ و زوو لەپێش چاو ئەكەویت ، لە (تیمار) سەعید ئاغایان زۆر مەرغوب نەبوو ، چونكە بە تەعبیری خۆیان بێدەستەلات بوو ... ئەم زاهیرەیە زۆر بەئاسانی وبەنهانی رەوشتی دیهاتی بۆ ئاشكار كردم ، كە ئەویش بۆئەمەی نفووزی لەناودەشتەكید بە قووەت بێ ئەبێ هەردەم لێدەر بێ پیاو خراپ بێ بەكوشتن مال سوتاندن ، مەرو مالات لێ دزین ، هەتك پێكردن ، لێت بترسێن ، پیاویش لە دەشتا بۆئەمەی كە خۆی نەشكێنی ئەگەر ئیدیعایكت هەبێ ، ئەبێ پیاوی دزو كاركردە رابگری ، ئەگەر ئیدیعاشت نەبێ ، ئەبێ مل بۆ یەكێكی دەست ئەستوور كەچ بكەیت .

ئەمە خاسیەتێكە كە لەگەل خوێن و گۆشتی دەشتەكی تێكەل بووە ئەم خووەشیان لە هەرە مێژوێكی دوورەوە وەرگرتووە لەو وەختە وەرگیراوە كە دراوسێیەكانی كورد تەخت و تاجی كەیانی یان لەناوبردو بە تەحریزو هاندانی رۆئەسای عەشایر لەزد یەك جامی ئیتیحادی لێ شكاندوون ، تەبیعی سیاسەتی (فرق تسد) لە زەمانێكی زۆر دوورەوە لە كوردستان تەتبیق كراوە ، كە تەفرەقەو خودپەسندی بەدەرەجەیەك (تركزی) كردووە ، كە ئەتوانم بلێم هەلكێشانی مومكین نیە ، تەبیعی ئەم خودپەسندیە كە هەموو مەعنایكی خۆش ویستن و تەماعی و حەسادەتی تێدایە ، هەر فەردێكی لە كوردا كە بیگری زۆر حەز لە (تەسەلوت) و لە لێ ترسان دەكا . ئەمەش ئاشكرایە كە هەر كامێكیان دەستی بوو لەم ناحیەوە درێغی ناكات ئەم خودپەسندیەی كە باسم كرد . ئەم رەوشتەی كە لە دەشتەكی هێناوەتە وجوود لە دەستەلاتدارەكان بە غرورو غەدر بەدیار ئەكەوێ ، لە بێدەستەلاتەكانیش حەسادەتی پێ بەخشیون ، ئەم حەسادەتەی كە ئەوانی هاویشتۆتە سەر تەبائیعی ئافرەت ، لە عەلەیهی یەك دووان ، عەیب بۆ یەكتر دیتنەوە ، خۆرەپێش كردن وە لە رێگای ئەم خۆرەپێش كردنە ئەنواعی نا جائیزی كردن بەرامبەر بەدەستەلات سەرومالیان هێن خۆیان نیە ، بەرامبەر بە پیاوێك كە لێی بترسن وە یا ئەمەلی شتێكی لێ بكەن پیاوی زۆر سەخی وچاوتێرن ، بۆ باقیتر قابیلی چرووك و دەست قووچاون .

بەلێ ئەم وەختەی كە مەلا هەمزەم لەگەل دائەنیشت و پێكەوە لە مەشاكیلی ژیان ئەدواین ، ئەم هەموو حەقائیقانەی سەرەوەشم لە مێشكدا ئەهات و ئەچوو ، زۆر مەئیووسو بێچارە ملم بو ئەم راستیە كە چ كردبوو بەلام محاوەلاتی زۆر فاشیلیشم هەر دەكرد .

رۆژێکیان کابرایەکی هەولێری کە ئاسنگەر بوو بەهۆی ئەوەی بەقەرز گاسن و ماسنی بۆ فەلاحەکان دروست کردبووو دەمەزەنی کردبووە ، وە بۆنەمەی قەرزەکانی بە دەغڵ کۆبکاتەوە ڕووی کردبووە تیمار ، تەبیعی هەموو لایەك زۆر حورمەتی وەستایان گرت وەستا پیاوێکی زەردەڵەی دەم قوچی ڕا لەخۆ بوو ، ئەمەی ئەزانی کە ئاغای ئەم گوندە سەعیدەو هەولێریە وە خۆشی هەولێریە ، ئەم حاڵە غرووریکی بێپەروای پێ بەخشی بوو ، لە مەیانی قسەدا پێیان ووت : وەستا خەتاب هەر پیاوە لەشوێنی خۆیدا چاوکراوەیە وەستا خەتابیش نەهیناو نەبردی ووتی «وەللا کرمانج قەت عاقل نابنەوە هەر کەرن !!» ئەم ووتارە منی تاساند مەجلیس قسمێکی وسکت و قسمێکیش بە عەسەبی‌یەوە پێ ئەکەنی ، مەلا هەمزەم هاتە پاڵ ووتی «ئەگەر سەعید ئاغا دەنگ نەکا ، من ئیمشەو بەزمێکی وا بەوەستا خەتاب دەکەم کە زۆری پێ پێبکەنین» جوابم دایەوە کە بەزمەکە بکات و مەسئولیەت لە ملەمن بێ ، مەلا هەمزە برایەکی هەبوو ناوی حەسەن بوو پۆلیس بوو بەسیلە[٢١] هاتبووەوە ئەلبیسەی پۆلیسی لەگەڵ خۆیدا هێنابۆوە برایەکەی ئەلبیسەی پۆلیسی لەبەرکردو سواری ماینێکیان کرد لەسەر بستەکەی دیار ماڵانەوە تفەنگێکی تەقاند بە ناو ڕووی کردە ئاوایی ، وەخت شەو بوو مانگەشەوێك وەك ڕۆژ وابوو ، ماڵی سەعید ساواریان ئەکوتایەوە ، ئاوایی بەجارێك بە ژن و پیاوەوە لە ساواری ماڵی ئاغا وەرهاتبوون . کە حەسەن بە سواری لینگی‌دایە سەر ئاوایی کەم کەس حەسەنیان ناسی‌یەوە ، بەڵام خێرا تێیانگەیاندرا کە دەنگ نەکەن . حەسەن بە عارەبی ووتی : وەستا خەتابی ئاسنگەری هەولێری لێرەیە ؟ ئێمەش ووتمان بۆ ؟ برایەکی ماڵی دزیاری لا ئاشکرا بووە ، لەسەر قسەی برایەکەی زۆرترینی ئەشیا لای وەستا خەتابە کە هینایەتی لە دەشت بیان فرۆشی ، ئێمە مەفرەزەین لە بەیانی‌یەوە بەهیلاك چووین ، ئەم دێهاتانەمان نەهێشت ئێستا لە (عەزە) ووتیان کە ئیمرۆ هاتووتە (تیمار) باش‌چاوەشە ئەفەندی وا لەسەر ڕێگا ڕاوەستاوە ئینتیزار ئەکا ئەبێ ئێستا تەسلیمم بکەن .. ئەحمەد چوو جەڵەوی ماینەکەی گرت ووتی . فەرموو دابەزە چایێك بخۆرەوە ـ پۆلیس قۆنداغە تفەنگێکی لێدا وەستا خەتابیش خۆی لەپشت دوو زەلام ئاخنی بوو بە کوردییکی شکستی هەولێریانی ئەیووت «جوو بووم لەسەر دەستتان مسلمان بووم ، تەسلیمی ئەم کافرەم نەکەن ، هەمن لە ڕێگا دەمکوژێتەوە» جوابی پۆلیسمان دایەوە کە وەستا

خەتاب نەهاتۆتە تیمار ، لەم ئانەش وەستا خەتابیان بە دوو سێ کەس برد چاروگەیکی ئافرەتانیان پێدادا لەگەڵ ئافرەتەکان هاویشتیانە بەر ساوار کوتانەوە ، بەم چەشنە پۆلیسەکە دوو سێ جاریتر هاتەوە هەرجارە بە جۆرێك لە مزگەوت یان لەسەربانەکەی جوریکی لە تەویلە .. ئیتر بەم چەشنە نەیان هێشت تا بەیانی وەستا خەتاب لەترسی پۆلیس بنووێ ، لەم مەیانە خۆی بە قوربانی هەموو شتێکی کرمانج ئەکرد ، بەیانی زوو لە خەو هەڵسا بەرەو هەولێر گەڕایەوە ئێمەش مەحموودی پیاوی سەعیدمان لەگەڵ ناردو کاغەزێکم بۆ کاکە سەعدی برام نووسی کەوا نیشانی وەستا خەتاب بدات پۆلیس ● بەغەلەتی ملی ئەویان گرتووە ، لەوسەر کە مەحموودە گەڕایەوە ، وەستا خەتاب گلۆزێك جغارەی غازی بۆ مەلا هەمزەو ئەم کەسانە ناردبوو کە رزگاریان کردبوو ، وە ووتبوشی سەلام لە هەموو خزمەکان بکە پێیان بڵێ مەراق نەکەن (الحمد لله) مەسئەلەکە درۆ بوو ، هەر بەمەش ئیکتیفای نەکردبوو ، بەلکو بۆ شەو دەستەییکی مومیشی لەسەر قەبری (شێخ ئەللا) سووتاند بوو پاشی سێ ساڵ زانیبویەوە کە ئەمە موئامەرە بوو ، زۆر تووڕەو سوێندیشی خواردبوو کە ئەمەیان لەسەر ناچێ ؟ !

ئەم حادیسە بەسیتە شتێکمان نیشان ئەدا کە دەشتەکی ئەگەر ترسیان نەبێ‌و (توجیە) بکرێن هەردەم بۆ موحافەزەی حقوق‌و کەرامەتی خۆیان فەعالترین دەستن .

گەڕامەوە هەولێر بۆ ئەمەی بچمەوە کویەلە پێش ئەوەی‌کە سەفەر بکەم حەفتەیەك لە هەولێر مامەوە ، ئەو قوتابیانەی کە لە بەغدا ئەیان خوێند ، هەموویان بە موناسەبەتی تەعتیل گەڕابوونەوە هەولێر ، لەوانە (سەید فەتاح سەید عەزیز) ناوێك کە لە (دار العلوم) دەی‌خوێند زۆر ئەفکاری کوردەواری سەوری بەرپا ئەکرد بەوبۆنەی کە من زۆر تینوی ئەو ئەفکارانە بووم خۆم لێی نەزدیك دەکردەوە لەو تەئریخی کفاحی پۆلۆنیام وەرگرت‌و خویندمەوە حەقیقەت‌و وەزعیەتی پۆلۆنیا زۆر بە وەزعیەتی کوردستانی حالی ئەچوو ، میللەتێکی گەورەو بە مەزیەت وولاتێکی بەرین‌و دەولەمەند ببووە (ضحیەی) سیاسەتی دراوسی‌یە بە قوەتەکانی سەدان هەوڵ‌و تەقەلای سەربەستیان‌دا هەموو جارێك فەشەل بوون بەڵام نەبەزین ئیسراریان لەسەر خەبات هەرکرد تا لە دوواجارا موەفەق بوون‌و بە ئاوات گەیشتن ، دیسان هەر لە سەید فەتاح کتێبی (قضیة الکردیة)ی

بلچ شێرکۆ دەستکەوت فەزایحاتی تورکیام خوێندەوە کە لەگەل کوردەکان کردبوویان بەڵام سەید فەتاح دیعایەی چەشنێک‌و تەکلیفی چەشنێکیتر بوو ، دیعایاتی سەوری دەکردو تەکلیفی دانانی جەمعیاتی تەعاونی‌و ئیقتیسادی دەهێنایە بەرو هەردووکی بە بۆیاغێکی حەماسەت بۆ بۆیاغ دەکردم ئەمانە سەریان لێ شێواندم لەپێش ئەمەی کە بۆم ساغ ببتەوە مرازی چیە وەیا بە ڕاستی بۆ چ چەشنە ئیشێک ئامادەیە چوومە کۆیە .

لە کۆیە زۆر گیر نەبووم چوومە (مەلا زیاد)[٢٢] بۆ سەر توتنچار عوسمان ئەفەندی ناوێک کە لە تورکیاوە بە خەبیری زراعی لە لایەن حکومەت جەلب کرابوو ، لە پاشان ئیستیغنای لێ کرابوو ئەم عوسمان ئەفەندییە ، لەسەر ئەساسی ئەمەی کە توتنی سەیناغ تووتن بەبێ ئاوپەروەردەکردن دەکات هاتبووە مەلا زیاد لە ئەرزێک توتنی داچاندبوو کە دەمزێ‌و ئاوەزەن بوو ، عوسمان ئەفەندی کوردی نەدەزانی لەگەڵ مەلا زیادییەکان هەر بە ئیشارەت قسەی دەکرد ، بەشەو غرامەفۆنی لێئەداو کرمانج گەل لە دەوری کۆ ئەبوونەوە ، بە ڕۆژیش ئیشی دەکرد بەم سوورەتە عوسمان ئەفەندی دەموسات مەشغوول بوو بەڵام عەسران ئەهاتە لای من قاوەی ئەخواردەوەو باسی خۆش خۆشمان بە دەم یاری (دۆمینەوە) لەگەل یەکتر ئەکرد ، حەقیقەت من لە منداڵییەوە هەندێک تورکیم ئەزانی وە لە گەورەیشدا بە موتالەعە ئیتلاعێکی زۆرم لە تورکی پەیداکرد ، ئەم جارە بەهۆی عوسمان ئەفەندی تەمرنییکی باشم لەسەر بە تورکی دواندن کرد لەگەڵ ئەوا پەچاکی لەهجەم ئیستیقامەتی سەند وە خەتی تورکی لاتینی لە ئەوەوە فێر بووم . عوسمان ئەفەندی پیاوێکی کورتە باڵای قەڵەوی دەم‌و چاو خڕوکاوی دەم بە پێکەنین بوو .

---

## - ساڵی ١٩٣٦ -

---

مەکتەب کرایەوە کە ئیکماڵی تەحسیلم بکەم مەجبوورمام کە بگەڕێمەوە هەولێر ، گەڕامەوە هەولێر ، بۆ کتێب کڕین چوومە کەرکوک لە ماڵی کاکەم حەمید دە ڕۆژ مامەوە ، زۆر بە حورمەت‌و ئینعای مەرامەوە گەڕامەوە . لە پێش ئەمەی

(٢٢) مەلا زیاد : گوندێکە کەوتۆتە سەر زێی بچوک‌و سەر بەناوچەی (تەق تەق)ە .

که دەستکەم بە زکریاتی (ساڵی ١٩٣٦) با ئەمەم لە فکر نەچی کە من لەم ساڵە لە عومری (١٨) سالیدا یەکەم جار بوو کە سینەمام دیووە ، لەمەوپێش هەر ناویم بیستووە ، وە ئەو فلیمەی کە یەکەم جار دیم فلیمێکی ئینگلیزی بوو ، چەتەیی و ئیجرامی تەمسیل دەکرد ناوی (Black eyes) بلاك ئایس بوو بەلام لام زۆر غەریب نەبوو چونکە لە (مبادئ العلوم) دا لە قیسمی فیزیا سینەمامان خوێندبوو من ئەسراریم ئەزانی .

«١»

حادیسەی موراقیبی عامی مەکتەب کە لە بەشی سالی ١٩٣٥دا بەیانم کرد بووە مایەی یەکیتی‌یەکی زۆر بە قووەت لەبەینی قوتابیە غەریبەکان و هەولێریەکان . هەروەکو باسم کرد بێجگە لەم حادیسەیەش ئێمە یەعنی قوتابیە غەریبەکان لە هەولێر هەر خۆشەویست بووین بەلام ئەم حادیسەیە (بالذات) مەجالێکی تری داینێ کە بە روحێکی پر ئیعتیمادەوە لەگەڵ یەکتر هەڵبستین و دابنیشین ، خورشید سەعید کە مودیری مەکتەبی متەوەسیتەی هەولێر بوو لەو سالەشدا نەعرەی (....) پەروەری لەباو بوو وە بەراستی بەناوی ئەوەی کە قوتابیەکانی هەولێری لە عەرەبیدا زۆر زەعیفن وە ئەبێ ئەمە چارە بکرێ وە ئەم چارەکردنەش بە دانانی لجنەی ئەدەب و خیتابە موباشەرە کرا ، ئەم لجنەیە بە (نظارەتی) موعەلیمی ریازە داودە ئەفەندی ئیدارە ئەکرا وە هەرکەسی کە داخیلی ئەم لجنەیە بایە ئیمتیازێکی ئاشکرای ئەدرایێ وە ئەغلەب ئەعزایانی ئەم لجنەیەش منداڵەکانی مەئموورین بوون بەم هۆیەوە تەفرەقەییکی زۆر لە سووئی ئیستیعمالی ئەم ئیمتیازانە کەوتە بەینی قوتابیان خاسەتەن ئەم ڕۆژەی کە حەفلەی یەکەمی ئەم لجنەیە هەر بۆ قوتابیەکان لە مەکتەب کراو لەم حەفلەیەدا مودیر وداود ئەفەندی هەردووکیان خوتبەیاندا و ، لە خوتبەکەیان ئەمەیان بەیان کرد کە هەرکەسێ بەجدی بۆ ترەقی ئەم لجنەیە تێ نەکۆشی لەپێش چاوی ئیدارە سووك و موحتەمەلە لە دەرسەکانی سقووت بکا لەو ڕۆژەوە هەموو سبەینان کە ئەچووینە مەکتەب لە سنفەکاندا لەسەر لەوحەی ڕەشدا جوملەی ناشیرین ناشیرین لە عەلەیهی کورد ئەنوسرا ، بەرامبەر بەم ئەعمالانە شکایەت کردن زۆر

فائیدەی نەبوو ، قوتابیـە کوردەکـانیش بەمـەجبووری لەبن جـوملەکانی وان جوابیان بە ناشیرینی ئەنـووسیەوە .. غـەریب نیە کـە ئەم جـوملانـە لەسەر دیوارەکانیش نوسرابوون ، بەلام غەریب ئەمەبوو کـە ئیدارەی مـەکتەب بـە شیدەت تەحقیقاتی ئەکرد کە بگاتە جوابدەرەکان ، تا رۆژێکیـان مودیـر ووتی ئەگەر تا مودەییێکی کەم ئاشکرا نەبێ کێ ئەم جوملانە ئەنووسی مەجبوورین کە (مەشبووهین هەموو تەرد بکەین)وە مەشبووهەکانیش ئاشکرا بوو کێنە ، چونکە هەموو رۆژێك لەلایەن ئیدارە تەحقیقاتیان لەگەل دەکرا لەتیفە ئەمـە بوو کـە مەشبووهەکان هەموو کورد بوون ئەو رۆژەی کە موتەسەریفی تازە (ئـەحمەد تـوفیق بەگ) زیـارەتی مەکتـەبی کردو بـە کوردی چـەند ووتـارێکیدا ، ئەم ووتارانەی موتەسەریف قوتابیە کوردەکانی لە هەست بەبێکەسی کردن رزگار کرد ، لەلایەکی تریشەوەش عەزمێکی بە قوەتی دانێ کە مقاوەمەت بکەن لەپاش هـاتنی موتـەسەریفو خـوتبە خـۆشەکـەی لە جەریـدەی (بـلاد)دا چـەنـد مەقالەیێکمان خوێندەوە کە دیفاعی (عەلی کەمال بەگ)ی تێدا نـووسدابـوو ، داوای تەتبیقی قانوونی لوغاتی محەلی دەکرد ، سەدای خوتبەکانی عەلی کەمال دووبارەکی لەپاش سکووت کردنی کورد مودەی شەش ساڵ ئەم سکووتیـەی شکاند ، ئینجا لەسەر ئەساسێکی تازە لە بەغداوە ئیدیعائات دەستپێکرا . لە هەولێریش کە قوتابیەکان ئاگایان لە هیچ نەبوو ، موراقەبەیان خسترایـە سەر بەڕاستی لە هەموو لایێکەوە تەزیق کراین ، شورتە مـوراقەبـەی ئەکـردین ، ئیدارەی مەکتەب عونفی ئیستیعمال دەکرد ، دیعایە لە عەلیهیمان زۆر بەقووەت ئیشی دەکرد ئیمە بەرامبەر ئەم هەموو عونفە لەپاش ئیجتیماعێکی کە لە رۆژی (٢٠)یکانوونی یەکەمی سالی (١٩٣٦) لەبەینی حەفت قوتابی کرا قەرار درا کە بە سوورەتی شکایەت ئەحوالی خۆمانو عونفی مەکتەب لە موتەسەریفی (لیواء)و ئەشرافەکانی لیوای هەولێر بنووسین . فیعلەن نووسرا وە ڕەوانە کرا . بـەلام بێجگە لە شتێك نەبی چ نەتیجەی مەحسوسمان نەکەوتە دەست ئەوشتەش ئەمە بوو کە لە زوبانی پیاوێکی گەورەوە بۆیان گێڕاینەوە کە بە سوورەتی واسـری شتیوا حەیەوی نیشاندان زەرەرە ، هەر کەسێکی کە ئەمانەی نووسیوە وە یا هەر جەماعەتێك کە ئەمەی کردووە بێن بە ئاشکرای ئیدیعا بکەن ئێمە تا ئاخیر نەفەس لەگەلیانین خێرا تێگەیشتین کە حکومەت بەرامبەر بەو نووسینانە زۆر مشەوەش بووە وەناشزانی کێیە ، ئەیەوێ بەم سوورەتە نیقاب لەسەر ئـەم

جەماعەتە لابدات ، تەبیعی ئەم نووسینانە کەوتە بەرچاوی هەموو کەسێکی لێوەشاوە بەراستی ئیستیفادەیێکی زۆری لەلایەن ئینتیباهی قەومی یەوە بەخشی .

«٢»

لەم ساڵە بوو ئەمر درایە مەکتەبەکان کە قوتابیانی سنفی سێیەم تەدریبی عەسکەری بکەن . خورشید سەعیدی مودیر کە ئیدیعای فتوایەتی ئەکرد لەگەڵ تەلەبەکان ئەویش جلکی فتوەی لەبەرکردو ئەچوو بۆ تەدریب بۆ ئەمەی کە عەمەلیەن قوتابیەکان لەسەر حەدیسی «إخشوشنوا فإن الترفَ یُزیلُ النعَم» تەعلیم بدات موافەقەتی لە مودیریەتی مەعاریف وەرگرت کە بەپێیان مەکتەبی متەوەستیە سەفرەیێکی ناوچیا بکات وە بۆ ئەمەش «میر ئاخور ئینتیخاب کرا» .

□□□

بەداخەوە لێرەدا کتوپڕ یادداشتەکە کۆتایی دێت و دڵدار لە نووسین دەوەستێ . ئەگەرچی بەشی هەرە گرنگی ژیانی دڵدار پاش ئەو قوناغەوە دەست پێ دەکات .

وە هۆی پچران و تەواو نەکردنی وەك ماموستا مەجیدی برای دەڵێت : «دوو دەفتەری تر یەکیان بەنووسینی من و گوتنی دڵدار ئەویتریان دڵدار بەدەستی خۆی نووسیبوی وە زۆر شتی بە نرخی ژیانی ئەوی تیدابوو نازانم چۆن .. وە کەی بزر بوون و لەدەستمان چوو ؟

وە دڵدار خۆشی بەرۆشی وون بوونی ئەو دەفتەرە لە سەرەتای یادداشتەکەدا دەردەبری و دەڵێ :ـ

«کەچی لەدواجارا ئەو دەفتەرەی کە موزەکەراتم تێدا نووسیبوّوە گەلێ شتی بە قیمەتی تێدابوو لێم وون بوو ،

نازانم کە کام دەست ئەم خەزێنە بە نرخەی لە دەست دام ... » سەرەرای ئەوەش مەرگی ناوەخت ماوەی نەدا نەك هەر ئەوە تەواوبکات بەڵکو گەلێ بەرهەمی پربەهاو ئاواتی تر بەجێ بینێ .

# «خوێندنی لە شاری کەرکوکدا»

دڵدار پاش تەواوکردنی پۆلی دووەمی ناوەندی لە هەولێر هەواری دیسان دەگۆڕێ و دەچێتە ماڵی ئاسەفی برای کە لە کەرکوك مووچە خۆری دایرەی «ڕەی» بووە ...

لە ساڵی (١٩٤٠)دا سانەوی تەواو دەکات ، وە ماوەی ئەو سێ ساڵ خوێندنەی لە کەرکوکدا پایەکی بەرزتر لە ژیانی دڵدار بەدی دەکرێ ، دەگاتە لوتکەی خوێن گەرمی لاویەتی و کامڵبوونی هۆش و بیری ، ئەو مەڵبەندە نوێیە هەوێنی شیعرو ماخولیایەکی تری بە گیانی بەخشیوە ، زۆر شیعری پتەوی نەتەوایەتی لەوێ داناوە وەك شیعری «ئەی ڕەقیب» وە شیعری «لاوی کوردان»و زۆری تریش بەرهەمی ساڵانی خوێندنی کەرکووکی یەتی .. ئیتر لە ساڵی «١٩٤٠»دا دەچێتە کولیجی حقوق لە بەغدا لە پۆلی (دووەما) دووا دەکەوێ و بۆ ساڵی ئایندە پێدا دێتەوە .

دەتوانین بڵێین ژیانی دانشگای تا تەواوکردنی ، ڕەنگ دانەوەی ڕاست و ڕەوانی زاتی دڵدار نیشان دەدات ، چونکە لەو ماوەیەدا بە تەواوی بەهرەو توانای دڵدار دەرکەوت و لە هەموو لایەنێکەوە ئاسۆی بیری فراوان بوو ... بێگومان تێکەڵاو بوونیشی لەگەڵ کۆمەڵگایەکی گەورەی پڕ هەمە چەشنەی ڕۆشنبیری و زانیاری ئەوسای شاری بەغدا کارێکی زۆری کردە سەر شەخسیەتی و لەناو زۆربەی زۆری خوێندکارانی کوردەوە ناسرا ، سەرەڕای خەریك بوونی بە خوێندن و بە سیاسەتەوە لەگەڵ ئەوەشا هەندێ بەرهەمی ئەدەبی نایابیشی بۆ بەجێ هێشتوین . وە لەهەموو شیعرەکانی دیارتر کە لە بەغدا دایناوە شیعری «خەندەکەی بابی» یە ، وە لەبارەی چۆنیەتی ژیانی ئەو چەند ساڵەی بەغدای بەشێوەی یادداشت و دەستنووسی خۆی هیچمان دەست نەکەوت بەڵام لەسەر داواکاری خۆم بەڕێز مامۆستا مەسعود محەمەد کە دۆستێکی گیانی بە گیانی دڵدار بووە نووسراوێکی لە بارەی بیرەوەری خۆی لەگەڵ دڵدارا بۆ ناردم ، وا ئێمەش بە سوپاسەوە دەینحەینە بەرچاوی ئێوەی خۆشەویست .



**دڵدار لە پۆلی یەکەمی (حقوق)دا**

**١٩٤٠/١١/١٧**

**ئەم وینە یە دەداتەموستەفا عوزیـری کەنـازناوی دلاوەربووە . لەپشتی وینەکەدا دڵدار ئەمەی لی دەتووس : « بەیادگاری دووا رۆژی رووناك ویەل دڵپاك پیشکەش کاکە دلاوەرکرا ئینمد دلدار**

**١٩٤٠/١١/١٧**

# «دەقی نووسراوەکەی مامۆستا مەسعود محەمەد»

سالّی «١٩٤١»ی زایینی کە لە کۆلیجی حقوق دەستم کرد بە خوێندن یەکێك بووم لە نێوان «١٠٠» قوتابی کە ئەو ساڵە لە پۆلی یەکەم قبول کران «٤» قوتابی دیکەش لە سالّی ڕابردوەوە مابوونەوە ، یەکێکیان «دلّدار» یونسی مەلا ڕەئووفە فەندی (خادم السجادە) بوو کەوا لەبەر ناساغی نەیتوانی بوو لە ئەزموونی کۆتایی سالّدا بەشدار بێت[٢٢] لەیەکەم دیتندا زەردیو بێ هێزی ئەو ناساغیەییم لێ ڕەچاو کرد دواتریش کەم کەمە ئاشنای باری ژیانی بووم .

سالّی یەکەمی خوێندنمان بەیەکەوە هەر بەایی ئەوەی کە دوو قوتابی کوردینو خەلّقی یەك شارین بەرەو یەکتری دەکردینەوە ، پێوەندی ناو کۆییو هاوڕێیەتیمان لەوەی تێپەر نەدەکرد کە ڕێز لەیەکدی بنێینو لە گیروگرفتی دەرسەکان پرس بە یەکدی بکەینو لە ڕێکەوتی دەوری مێزی چێشتخانەیەکدا پێشدەستی مەسرەف بەملەوە گرتن بۆ یەکدی بکەین . لە ڕابردوودا وەها لەیەکدی نزیك نەبووین کە بەیەکەوە خوێندنمان لە بەغدا ببێتە قوناغی چەسپاندنی برادەریەکی کۆن . بەڕاستی هەردووکمان خەریكبووین ، بە خامۆشی . لەنوێوە تانو پۆی برایەتی بتەنین .

دلّدار قوتابیەکی دلّ زیندووی هۆشیاری مێشك کرایەوەبوو . ڕەنگە گومان لەوەدا نەبێ کە لەمەهەری «لالی» لە بەرایی ئاخاوتنیدا ، وەك بناوانێکی پەنگاو بە ئاو بداتەوە ، هەموو گوتە نەبێژراوەکانیو بیروباوەڕە ئاشکرا نەکراوەکانیو هەستو سرکەو کورکە خەفەبوەکانی دابێتەوە دەروونیو لە ناخی گیانیو هۆشی ونیدا بووبێتەوە ئەو بژێوە مەعنەوییەی جارەهای جار بەدەم ورووژانی عاتیفەیەوە وەك تافگە هەلّدەڕژا . لەوبارانەدا کە هێزی خەفەکراوی ئاخاوتنی ڕەها دەبوو تۆلّەی ئەو جارانەشی بۆ دەستاندەوە کە بەزەحمەت مامڵەتی پاکەتە جگەرەیەکی تێدا دەکرد .

ڕێبازی ژیانی سالّی یەکەممان لە حقوق بە دراوسێیەتی برادەرانە

گەیاندنیە پشووی هاوینە ، بێ ئەوەی تێکەڵ بە یەکدی ببینەوە لەو ساڵەدا خوا لێخۆشبوان کاکە حەمەی خانەقاو عومەر عوسمانو من ، ناوی «الفرسان الثلاثة» مان بێ ڕەوا دیترا بوو ... هەرسێکمان لە کۆلیجو دەرەوەی کۆلیج هەمیشە بەیەکەوە بووین تا ئەگەر یەکێك منی ویستبایە دەیتوانی بەدوا عومەردا بگەڕێتو بمدۆزێتەوە بەداخەوە عومەر هەر لەوساڵەدا دووچاری ناساغیەك بوو کە دەرفەتی پێنەدا نیوەی خوێندنی حقوق تەواوبکات وزۆریشی مۆڵەت نەدا جوانە مەرگی کرد .. ماینەوە کاکە حەمەو من .. دڵداریش بەرە بەرە لێم نزیکتر دەبۆوە ، وەك کە لەگەڵ کاکە حەمە پێشتر برادەرییان ڕەگو ریشەیەکی داکوتابوو . لە باری گوزەرانەوە دڵدار ساڵی یەکەمی بە پۆشتەیی بردە سەر ، لە برایەکی گەورەتریەوە کە لەناوچەی ناوەندی عیراق مووچە خۆری حکومەت بوو ، خەرجییەکی تێروتەسەلی بۆ دەهات . ئەوساش جاریّ جەنگی دووەم تەنگی بە ئابووریو نرخی پارەی مووچە خۆران هەڵنەچنی بوو کە دەستیان لە یارمەتی کەسو برا کۆتا بکات ... بەلام بە حاڵ سال چووە سەر کە براکەی دەستی لە ئێش کێشرایەوەو دڵدار کەوتە سەغڵەتی گوزەرانەوە . ئەوەی لێرەدا پێویستە بۆ باسکردن ، ئێزن لە گیانی دڵدار بخوازمەوە ، جوامێری بەرەیەکی نیشتمانپەروەری کۆیی بوو کە بەسەرحاڵوباری وەك هی دڵدار ڕادەگەیشتنو بەلای کەمەوە لەسێ بەشی خەرجی بەڕێوەچوون دوو بەشیان جێبەجێ دەکرد بێئەوەی هەستێکی تێدا بریندار ببێ بە پێچەوانە لەخانەی حورمەتو بەرەو پیری ئەو کارەوە دەچوون ، تەنانەت دوای مەرگی باوکم لە «١٩٤٣» هەمان دەستی یارمەتی بۆمنیش درێژکرا بەلام من ئەو پێویستیەم نەبوو کە ببمە هاوبەشی ئەوانەی دەستیان تەنك بوو . لە ساڵی دووەمی خوێندنمانەوە پێوندی نێوانمان بەرەو پتەوتریەوە ڕۆییو لە چەندو چۆنی یەکتر شارەزاتر بووین ، هەندێ خەسڵەتی دڵدارم لەو ساڵەدا بۆ ڕوون بۆوە ، تێگەیشتم دڵدار گەنجێکی ئازایە ، پربەپێستی ووشەی ئازایش ئازایە . جاریّ لەلایەن ئەوەی کوردی پێیدەڵێ «ماڵی دنیا» دڵدار فلسێكو دیناریکی بەلاوە یەکشت بوو ... دەیتوانی چی خوا پێیداوەو پێی نەداوە بە قوربانی نیازێکی بچووکی برادەرەکەی بکات ، پەندی عەرەبی کە دەڵێ «اصرف ما في الجيب يأتك ما في الغيب» بە قاڵبی دڵدار داڕژابوو ، هەژاریەکی کە خۆی لەبارەی خۆیەوە باسی دەکات لە جیاتی لێگرتنەوەی خەرج کردن بووبوە هۆی دەستبلاویو گاڵتە بە هەبوونیو

نەبوونی کردن . دەست کورتی بابی تۆسقالێك عەزمی نە شکـاندبـوو چونکـە ئازاییەکەی لە تێشکانی هەژاریەکەی پتری بۆ تێ دەهێنایەوە . نەمدیت ڕۆژێك لە ڕۆژان دڵدار قسە قووت بداتەوە یا لە هەلوەست دابەزێ بە مەرایی کردن بەرانبەر نەوازشت و پارمەتی ئەم و ئەو هەر ئازایەتیەکەشی بوو بەسەر تێوەمانی نەداریدا زاڵی کردبوو تا ئەوەی حیسـابی دەستکورتی لە ڕووپـەڕەی کرداری دڵداردا سڕابۆوە .. هەروەك ڕیخۆڵە کوێرە بە کەسەوە دیار نییە نەداریش بـە کـردەوەی دڵدارەوە دیار نـەبوو ، لە کـەسیشەوە هـەست نەدەکـرا دڵدار بە دەستکورت دابنێ ، هەر لە ئازایەتیشەوە بەسەر گیروگرفتی زمانیدا بەرەو ئەو کارانەوە دەرۆیشت کەوا پەکیان لەسەر زمانی پاراو کەوتبێ وەك کە یەکێك بوو لە چالاکترین ئەندامانی پارتی هیواو گەرمترین دەمەتەقەی بـە دەوری کردەوەو ڕەفتاری ئەو حیزبەو ئەندامەکانی بـەرپادەکـرد ، ئینجا نـوکتەشی لە خـۆیو برادەرە لاڵەکانی وەك خۆی دەکرت ... جارێکیان برادەرێکی هەردووکمان کە ئەویش لاڵ بوو پێمان‌گەیشت و ڕووی لە دڵدار کرد گوتی (ها .. لاڵەپەتە ...) دڵدار قسەکەی لێ قوستەوە کورج گوتی (ها ... قەل بە قەل دەڵێ ڕووت ڕەش بێ ...)

دڵدار مرۆڤێکی ئازا بوو ...

لە پۆلی دووەمی حقوق دڵدار دەرگەیەکی بە ڕوومدا کردەوە ، دواتر بوو بە کولانەیەك بۆ ناو دەروون و دل ویژدانی خۆی : بردمی بۆ سلاوخانەی «بهية فرج الله الكردي»

ئەم خاتوونە کیژی (فرج الله الكردي) بوو کە لە میسر بە برادەرایەتیو هـاوڕێییو پشت‌گیری «محمـد علي عـوني» کتێبی شەرەف نـامەی بـە چاپ گەیاند ... بەهیـە ، دوای مەرگی بـاوکی بە خـۆیو دایکی هاتنـە عێراق و لە قـوتابخـانەیـەکی بـەرزی کچـان دەرسی دەگـوتـەوە ، لە ڕادیـوش گـوتـارو سەرگورشتەی بۆ ئافرەت و مندالان دەگێڕایەوە . لە حورمەتی باوکی لایکورد ، پشکێکی گەورە بۆ ئەو کیژە مابۆوە لێهاتوویی خۆیشی وەهای کرد سلاوخانەکەی لە «أعظمية» شێوەی سالۆنی «میزیادە»ی قاهیرە وەربگرێ . فرج الله ئاشنایی لەگەڵ باوکمدا هەبوو ، چەند نامەیەکەیشی بۆ باوکم یادگاری ئەو ئاشنایییە بوو لێی بەجێمابوو . کاتی خۆی کە «شرفنامە»ی بلاوکردەوە چەند دانەیەکی لێنارد بۆ لای باوکم ... ئەم پێوەندییە کۆنینەیە ڕێ خۆش‌کەرەوەیەکی دروست بوو بۆ

ئەوەی بەهیە بەخێرهاتنێکی گەرم و گوڕم لێبکات . فرج الله بە خێزانەوە بەهایی بوون ... بەرلەوەی من ببمە ناسیاوی بەهیە ، دڵدار چەند جاران لە بارەی دینی بەهایی لەگەڵ پێشەواکانی مەحفەلی بەهایی بەغدا هەر لەماڵی بەهیە ، وتووێژو گفتوگۆی کردبوو ، هەندێ تێبینیشی لە باوەڕی بەهایی لێ وەرگرتبوون ... شەوانی رۆژەك لە ڕۆژەکانی هەفتەدا سلاوخانەی ماڵی بەهیە پێشوازی لە مێوانان دەکردو چەندین سەعات مەجلیس ئەدەب و نوکتەو قسەی ڕێك وپێك بەردەوام دەبوو ... بەزۆری دڵدار ومن ، ناونـاوەش لەگەڵ کاکە حەمەی خانەقادا ، بەیەکەوە دەچووین بۆ لای بەهیە ، دەبوو لە ڕۆژی تایبەتیدا بێ مێوان و بێکۆبوونەوە سەرمان لێیدەدا هەندێ جار هەر لای ئەو نیوەڕۆژمان دەخوارد ، بەهیە لەگەڵ دایکی بە فارسی دەدوا چونکە کوردییان نەدەزانی هەرچەند گیانی کوردایەتییان زۆر پێوە دیار بوو بە عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسەیی و فارسی جوانترین شێوە ئاخاوتنی هەبوو وابزانم دڵی زۆر کەسی بۆ چووبوو بەلام تا ئەوەندە من بزانم دڵی ئەو تەنها بۆ کوڕە دەوڵەمەندێکی سلێمانی کە برادەرم بووو یەك دوو ساڵێك دوای پۆلی من بوو لە حقوق ، لێیدەدا هەرچەندە ئەو کوڕەش بەهیەی خۆش دەویست چارەنووس لێکی ترازاندن ... لە بەهیەم بیستوە دەیگوت ، ئاواتمە شوو بەگەنجێکی کورد بکەم و بمباتە دێیەکی کوردستان وڕێم پێ بدا خزمەتی ئافرەتی کورد بکەم ... دڵداریش ئەمەی لێ بیستووە ڕەنگە گەنجی دیکەش گوێ بیستی بووبن . بۆمن بەهیە خوشکێکی بەڕێز بوو کە ئیتر پێشنیازی ئەوتۆیی لای من دەنگ نەداتەوە . ئەوساش جارێ ئەو برادەرەمی نەدیتبوو کە دواتر دڵی بۆی چوو ، ئیتر نازانم بۆچی ئەو ئاواتەی نەگەیشتەجێ .. لەوساڵەدا کە ساڵی دووەمی خوێندنم بوو لە حقوق هەستم نەکرد کە دڵدار لە ناوەوە بۆ بەهیە دەسووتێ ساڵی سێیەم و چوارەمی خوێندنمان کە (٩٤٣ ـ ٩٤٤) و (٩٤٤ ـ ٩٤٥) دەگرێتەوە دڵدار و من لەیەك ژووری ئوتێلی «رشید»ی گەرەکی «سید سلطان علي» مان بەسەر برد . لەو دوو ساڵەی خوێندندا بە یەکەوە ژیانمان هەموو ئەو ڕووپەڕە دەروونیە شرایەوەی کە بشێ بۆ بەرچاوی برادەر بکرێتەوە ، بۆ یەکترمان کردەوە ... بەلام لە گۆشەی حەزو دڵدارییەوە باسی بەهیەم هەرگیز لە دڵدار نەپرسی چونکە دەمزانی حەز لێکردنێکی یەك لایی یەوە بۆ ئەو بەسفت و سوێە . دەبێ لێرەدا بە خوێنەر ڕابگەیەنم کە دڵدار و من لە ماوەی «٤» ساڵی خوێندنماندا ڕۆژەك لە ڕۆژان و لە هیچ ڕێکەوتێك و

رووداوێك‌و هەڵوەستێكدا بە هیچ جۆرێك دڵی یەكترمان نەئێشاندووەو هەرگیزاو هەرگیز لە پلەی ڕێز لێگرتن بۆ یەكتر دانەبەزیوین . دڵدار ڕاستی لەو ساڵانەدا هاوڕێیەكی نموونەیی بوو ... سەر لەنوێ ، دوای دابڕانی جوانە مەرگ عومەر عوسمان كاكە حەمەو دڵدارو من ناوی «فرسـان الثلاثـة» مان پێدرا چـونكە بەزۆری بەیەكەوە دەدیتراین تەنانەت جارێكیان برادەرێكم بانگ هێشتنی كردم بۆ ماڵەوەی گوتی «جگە ـ لە كاكە حـەمەو یـوونس كێی دیكەت دەوێ بـانگی بكەم ...

دووەمیان ئەوەبوو حیسابی بۆ خەون دەكرد . هەر لەبیرمە مـاوەیەكی كورت بەر لە ئەزموونی ساڵی چوارەممان ، سبەینـەیەكیـان دڵدار خەونی بـۆ گێرامەوە گوتی لە خەوما تۆو من ، بێ كاكە حەمە ، دەرۆیشتین تۆ لەپێشـەوە منیش لە دواتەوە تا گـەیشتینە كـۆسپێك تـۆ بێ زەحمەت لێی سـەركەوتیت‌و بەرەوپێش چوویت منیش لە كۆسپەكە كەوتم‌و هەڵستامەوەو بەدواتدا هاتم ... گوتی لێم سووره تۆ دەردەچیت منیش ئێكمال دەبم‌و دەردەچم كاكە حەمەش ، ڕەنگە ، ئیمساڵ بمێنێتەوە .

ئاكامیش وەها دەرچوو . دڵدار لەو دوو ساڵەدا دەروونی ئاوس بـوو بە عیشقی بەهیە بێ ئەوەی ڕۆژەك لە ڕۆژان بدركێنێ خۆشی‌ویستوه . هـەر ئەو خۆگیریەی بوو لێ نەگەڕا بپرسم ئەرێ دڵدار تۆ كە ئەم كیژەت خۆش‌دەوێت ، ئەویش بە ئاشكرا دەیەوێ شوو بە گەنجێكی كورد بكات ڕێی براتێ خزمـەتی ئافرەتی دەشتەكی بكات ، گوندیشتان هەیـە بەسـەر زێی تەقتـەقەوە ئـەگەر داهاتیشی كەم بێ خۆ ئافرەتی زۆرە ئیتر بۆچی نایخوازیت ؟ !كەم‌و زۆر دەرفەتی ئەم پرسیارەم لێی چەنگ نەكەوت . دەشێ ئەویش چاوەنۆڕی دەرفەتێكی لەمنەوە كردبێت‌و چەنگی نەكەوتبێت تاكو دەردی دڵی بلێتەوە . وەك دەزانم لای كاكـە حەمەش هیچی لەم بارەیەوە نەدركاندوە بەداخەوە ئاگرەكەی وەك ژیلەمۆی ژێر خۆڵەمێش خۆی دەخواردەوە ، گەرماییشی هەر ئەوەندە دەدایەوە كە لە هەندێ پارچە هەڵبەستی بە د یاری دەدا ، یەكێك لەوان «خەندەكەی بابی» : ئەوانەی بە شیعرو بەسەرهـاتی دڵدارەوە خەریكن دڵنیـا بن لەوەدا كە فـرشتەی نـاو (خەندەكەی بابی) بەهیە فەرەجوڵلایە . لە نووسینی دیكەمدا گوتوومـە ژان‌و ژواری هەناوی دڵدار بەو مەلۆتكە شیعرە لەو دەمانەدا بوو كە بـەیەكـەوە لە

ژوورێکی ئوتێلی ڕەشیدی بەغدامان بەسەردەبرد ، وا لێرەدا زەرقی ئەو بوحرانەشم باس کرد کە عاتیفەی تێدا تەقیەوە . ڕاستیەکەی دڵدار بۆ ماوەی یەك دوو هەفتە بەدەست ئەو هەڵبەستەوە وەك نیوە سەرخۆش وەیا نیوە مەدهۆش بە تەواوی نەیدەزانی چۆن وچی دەکات ، هەمیشە چاوەکانی دەبڕیە دیمەنێکی خەیاڵی تەنانەت لە ڕۆییشتندا کەمتر ئاگاداری بەرهەنگاوەکانی بوو .. بەسەر خواردنەوە لە لوقنتە ڕادەما ... هێندێ جار قسەم بۆ دوویات دەکردەوە ئینجا تێم دەگەیی ... چەندێکیش لەو هەڵبەستە هۆنیبایەوە بۆمی دەخوێندەوە ... وا دەبوو بەدوا ووشەیەکدا دەگەڕاو پرسی پێدەکردم . لە شوێنێکی دیکەدا نوسیوەتم کە لەبری ووشەی «چەپك» بۆ وشەیەکی لێ پرسیم کە یەك تاڵ نەك چەپك ببەخشێت بەداخەوە ئەوسا نەمتوانی یارمەتی بدەم .. دڵدار لە هیچ هەڵبەستێکدا هێندەی «خەندەکەی بایی» زۆرەملێی لەگەڵ عاتیفەو شاعیریەتی خۆی نەکردوە هیچ پەری‌و فرشتە ئادەمیەکیش بایی ئەو هەڵبەستە ئارایشتی لە دڵدارەوە بۆ نەچووە ...

لە لایەن فکرەو فەلسەفەی سەربە کۆمەڵایەتییەوە ، دڵدار ، لەو سالانەدا بەلای تەقدیسی تاکە بێمانەندەکانەوە دەچوو تا ئەوەی جارێکیان لەوتووێژدا پێمی گوت گەل وەکو ئەوتۆمۆبیلە یە کە بێ لێخوڕ نابزوێت لە وەرامدا پێم گوتەوە گەل ئەگەر کەسیشی سەرۆك نەبێت بە گوزەرانەوە هەر خەریك دەبێت ... بەجۆرێك لە جۆران دەجووڵێت ... ڕادەبوێرێت ... زاوزێ دەکات ... ڕاوڕووتێك دەکات ، لێمی نەسەلماندو هەر لەو قسانەدا چووە بۆ باوەڕی کارلایل‌و کتێبەکەی کە لە عەرەبیدا بەسەرەناوی (الابطال) تەرجەمە کراوە . فکری خەستی قەومایەتی دڵدار کە لە سروودی (ئەی رەقیب)دا دەردەکەوێت‌و وێنەکێشی ویژدانی کۆمەلایەتی ئەوسایەتی ، لە ووتووێژدا خەستترو پالاوتەتر رابەر پەرست خۆی دەنواند ... دڵدار لە ئاست هەژاریدا دوو هەڵوەستی پێچەوانەی هەبوو ... یەکیان ئەوەبووکەوا نەك هەر شەرمی لێ نەدەهاتەوە بگرە گاڵتەشی پێدەکرد وەك کە گاڵتەی بە سامانی ساماندارێش دەکرد . دوەمیان ئەوەبوو کە لە خۆوە دەستی بۆ کەس پان نەدەکردەوە تا ئەگەر لە برسانیش مردبایە . بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵەیان ڕووداو دەگێڕمەوە . دوو ساڵی بەیەکەوە ژیانمان هەموو پەردەیەکی بێگانەتی لە نێوانماندا هەڵگرتبوو تا ئەوەی دەتوانم بڵێم کیسە جودایمان نەما بوو . کاکە حەمەی خانەقاش بۆ دڵدار

هــەروەها بــوو . لەگەڵ ئــەمەشــدا ڕۆژەك لە ڕۆژان دڵدار داوای فلسێكی لێ نەكردووین ... بەڵێ بەیەكەوە دەژیاین و دەمانخواردو دەچووینە گەڕان بــەڵام وەهابووە شەوو ڕۆژێك لە یەكدی دابڕاوین بەهــۆی خەریــك بوونی دڵدار بــە حیــزبایــەتییەوە ، ئینجــا كە ڕۆژی دوایی بــە دەوری مێــزی چێشتخــانــەوە كۆبووینەتەوە تێی گەیاندووین كە لە دوێنێوە هیچی نەخواردوە چونكــە دوایین فلسی لە پێرێوە خەرج كردوە ، بە كەسیشی نەگوتوە برسییەو پارەشی پێ نییە . لەو بارانەدا گلەیی دنیاو قیامەتمان لێ دەكرد لەوەدا كە بۆچی پێشتر دەنگی نەكردوە خۆ ئێمە ماڵمان كاول نەبوو بوو بەڵام هەرگیز نەمانهێنا سەر ئەوبارەی لە خۆوە ئیعلانی ئیفلاسیمان بۆ بكات .

لە كۆتایی ساڵی چوارەمی خوێندنم ناچار بووم بۆ ماوەی (٢٠) ڕۆژێك بچمە ئــوتێلێكی دیكەو لەژوورێكــدا تەنهــا بیم بەڵكــو بتوانم نــەختێــك خێــرایی لە خوێندنەوەی دەرسەكانم بكەم كە بە درێژایی ساڵ بــۆم نەكــرا بوو ســەریان پێدابكرم [ئێرە جێی باسی ئەو هۆیانەی تێدا نابێتەوە كە ئەو ساڵە منیان لە خوێندن تەنبەڵ كرد] .

كاكە حەمەش هەر لەو ئوتێلە ژووری گــرتبوو ئیتــر ڕۆژێ هەرسێكمــان بەیەكەوە دەبووین شەوێش هەروەها تا دەمی نووستن . ڕۆژانی ئیمتیحان دڵدار لامان دەبوو تا دوای نیوەشەو ، سبەینانیش دەهاتەوە لامان و بەیەكەوە بە تاكسی دەچووین بۆ كۆلێج . سبەینەیەكیان دڵدار دەرنەكەوت . چاوەنۆڕی بــووین تا ئەگەر چی‌دیكە وەخرابابین نەگەینە ئیمتیحان ... چوینە كۆلێج . لەو دەمەدا كە زیلی چوونە ژوورەوەی لێدەدا ، دڵدار پەیدا نەبوو ... كاغــەزی پرسیــارەكان بەسەر قوتابیاندا دابەش دەكرا ئینجا دڵدار بە هەناسەسواری هاتە ژوورەوە ... پاش ئەزموون لێمان پرسی بۆ وەها وەخرا ؟ گوتی لە ڕۆژان درەنگتر خەبەرم بۆوە ڕامكرد بۆ ئوتێلەكەتان دەرچووبوون ... پارەی پاسم نەبوو بە پێیان كوتام ... بەڕاستی خەریك بووین لێی‌دەین : هەی ماڵت شێوێ تۆ شەوێ تا دوای سەعات (١٢) لامان بوویت ... بەیەكەوە لەوەڕاین ... كاكە حەمە پێی‌گوت ئۆغرت بەخێر نەبێ بۆ شەوێ نەتگوت دنیارێكی خوێڕوو سەد فلسێكی بێ‌نامووسم دەنێ هیچم پێ نییە ؟ بەر لەو جارە هێشتان لەگەڵ یوونس بووم ونزیكی مانگێكی مابوو بۆ ئیمتیحان عەسرێكیان هاتەوە ئوتێل گوتی من لە ئیمتیحان قبوڵ ناكرێم ! منیش لە جێگەدا بووم ڕاستبوومەوە سەبەبم پرسی ، گوتی دووقستی (اجــور مدرسي)

قەرزدارم ئیعلانیش کراوە ئەوەی قـەرزدار بێ ڕێی پێ نادرێ بچێتـە ژووری ئیمتیحان منیش ئەو پارەیەم نییـە ـ گوتم کـاکە یـونس ئەگـەر من لە جێگەی تۆبامایەو تۆ لە جێگەی من چیت بۆ دەکردم ؟ گوتی باخەڵبڕیشم بۆ کردبایت پارە کەم بۆ پەیدا دەکردیت ... گوتم ئینجا بۆچی هێندە خۆت لە برادەری خۆت پیاوتر دەزانیت ؟ پارەکەم بۆ پەیدا کرد بزەیەکی هاتێ ... پرسیم چیتەوە ؟ گوتی چاوم فریوە ئەم پارەیەش بایی فرینەکە ناکات چونکە پارەکە بۆخۆم نییە ... بە ڕێکەوت نزیکی ڕۆژاوا هاتمە جادە خاڵوانم لە ڕانیەو پژدەرەوە هاتبوون بە عادەتی خۆیان خەرجییەکی تێروپڕیان دامێ کە زۆرم لێ زیاد بوو ... گەڕامەوە ئوتێل گوتم کاکە یونس پارەی ئەو دوو قیستەو حەقی چاوفرینیشت لە منەتدا نەما ... خوا زۆری ناردوە .. چەندگەشو پاك بوون ئەو ڕۆژانە !!!!

دڵدار لە برادەریدا سنووری نەدەهێشتەوە : بەڵێ ڕاستە لە خۆوە داوای پارمەتی نەدەکرد بەڵام . لەوپەڕی جوانمەردیدا ئەو بێ فەرقیەی دەکـرد کە ئەگەر لێت وەرگرتبایە منەتبار نەبیت ئەگەر لێشی وەرگرتبایت وەها بزانیت بـە خۆت داوە . شەخسیەتی خۆیشی ژووررووی ناچاریو بێگوزەرانیەوە دەگرت لەو ڕووەوە کـە هەبـوونو نەبـوونی لە هەمـوو حیسابێکی «ڕەفتـارو گوفتـار» دەرهاویشتبوو ، تاکو جارێکیان هاتەوە ئوتێل قاپووتێکی لەبـەر بوو کـە دەمی بەیانی دەرچوو لە ئوتێل نەیبوو .. لێم پرسی ئەمەت لەکـوێوە ؟ گـوتی ئەمـە قاپووتی فلانە جوانە مەرگە براکەی ئیمرۆ بۆمی هێنا ، دەیزانی پێم دەوێ .. ئەو «برا» یەی دڵدار ناوی هێنا دۆستی ئەویش و منیش بوو بەر لە دوو ساڵێك برایەکی لە خۆ گەورەتری کە ئەویش قوتابی حقوق بوو جوانە مەرگ بـووبوو ... دڵدار ئەگەر حیسابێکی بۆ نوێیی وکۆنی جلك وە یا بەرماوەی زیندوو مردوو کردبایە قاپووتەکەی لەبەرنەدەکرد ، بەڵگەش ئەوەیە کەبێ دوو دڵی کردن چۆنیەتیەکەی بۆگێڕامەوە وەك ئەوەی بڵێ لە «سوق الهرج» بە دینارێکم کڕیوە ... بەلای ئەوەوە بوونی دۆستایەتیو نەبوونی منەتباری تەنها شتێکە لەو تەرزە بارەدا حیسابی بۆ بکرێ ، ڕاستیشی بۆ چوو بوو هەرچەند ڕەنگ بوو من هێندەی ئەو ئازا نەبمو شەرمی بێجێو بێ لزوم بمگرێ ... ئەم تەرزە خەسڵەتە لە دڵداردا شیرنتری دەکرد چونکە لە ترووکەیەکی چاودا ماوەیەکی بەرەو ئاشنایی وبرایەتی دەبڕی کە کوردە غیرەتی بە دوو ساڵ نایبڕێ . وابزانم لە قووڵایی دڵیدا هەستی ئامادە

بوون بۆ خۆ له بیرکردن له پێناو بـرادەر هەمیشـه دەیهێنا سـەر ئەو بـاوەڕە کەڕەتکردنەوەی یارمەتی برادەر دەکێشێتەوە بۆ گومان له خۆکردن‌و بەخۆدا ڕانەپەڕموون له مەیدانی تۆڵە بۆکردنەوەدا : دڵدارێك هیچی له برادەر چاونەبێ بۆچی کۆمە بکات له چاکەی برادەر ؟ بۆچی ڕێی دڵسۆزی له برادەر ببەستێ ؟ دەزانم ، لەو دەمەدا کە هەیبوو قوتابیەکی پۆلی خۆی کەوا تازە بەتازە یەکدی دەبینن‌و بەحاڵ ناوی یەکدی دەناسن ، له سەغلەتیدا داوای پارەی لێ کردبوو . دڵدار چاکەتەکەی له ژوورەوە بوو خۆیشی له سالۆنی ئوتێل دانیشتبوو ، بـەو قوتابیەی گوتبوو زەحمەت نەبێ بچۆ ژوورەکەم‌و سەیری گیرفانەکـانم بکە .. چەندی هەیە دەتوانیت بیبەیت ، ئەو قوتابیە کە بۆخۆشی جەوانمـەرد بوو لەو ڕۆژەوە بوو بە برادەری گیانی دڵدار ، دواتریش بوو بە برادەری من تا ئێستاش هەر برادەرین .. من کە ئەم ڕووداوە بچووکانە له دڵدارەوە بۆخوێنەر دەگێڕمەوە دەمەوێ لەڕێی واقیعەوە نەك تەنها باوەڕی شەخسی یادی دڵدار بێ زیادو کەم هەناسە هەڵێنێ ، ئەوساش گوزەران وەك ئێستا نەبوو حیسابی بۆ نـەکرێ ، هەژاریش ئەو دەردە نەبوو بە ئاسانی چارە بکرێ ، دڵدار کە داوای لێکرا ، له کوشندەی دەستکورتیدا کچێکی «زەهاوی» فێری کوردی بکات وتەکلیفەکەی هەڵگرتەوەو پاداشەکەی ڕەتکردەوە [واتە بێ پـارە ڕۆژانە دەرسی بـەو کچە دەگوتەوە هەرچەند کچەکـە زۆریشی هەوڵدا خـزمەتێکی لێ بسـەلێنی] دەبێ حیسابی ئەوەی بـۆ بکەیت کـە مامـۆستایـەکی ئیمرۆ کـە لەگەڵ مـانگانـەی تێروتەسەلیشدا له بری هەر دەرسەکی خارجی کە دەیلێتەوە «١٠» دینار «٢٠» دینار «٣٠» دیناریش وەردەگرێ .. کوردی دەڵێ : هەر کەسە گوێز لە هەنبانەی خۆیدا دەژمێرێ ، منیش دەمەوێ گوێزی دڵدار بە وەکالەتی ئەو ، له هەنبانەی خۆیدا بژمێرم نەك له خەرمانی تێکڕای گوێزی عالەم . بارەهـا لەگەڵ خـۆمدا لێکدانەوەی ئەوەم کردوە ئایا ئەگەر من لەوەزعی دڵدارا بوومایە خوێنـدنم بۆ تەواو دەکرا ؟ تەنگانەی دەستکورتی‌و لەمپەری زمان‌و بێ ئومێدی له ڕەوینەوەی ئەودوو گرفتە زلە کۆڵیان لێ دەدام بایی سەر بە کتێب داگرتن‌و تێکەییشتنی ؟ ئایا دەمتوانی شەوو ڕۆژێك نان نەخۆم‌و قوتابیش بم ؟ دەمویرا بە زمانی لاڵەوە ڕوو بە ڕووی جەمیوورەی بینەران‌و گوێگران وەرگەڕێمە خوتبەی سەرپێی یەك سەعاتی ؟ هەڵبەستم بۆ دەهات ؟ نەخێرو سەد جار نەخێر . له دوای مەرگی باوکم کە گەڕامەوە بۆ بەغدا له بیرەوەری «٤٠» ڕۆژەی مردنی‌دا ئاهـەنگێکی

تازیەمانەی بۆگەڕا لە یانەی سەرکەوتن ... نۆرەی دڵدار هات گوتارەکەی بخوێنێتەوە . چەند دێڕێکی لێ خوێندنەوە زمانی گیرا ... ویستی بە تانووت لە خۆدان زمانەکەی بەگەڕ بهێنێتەوە ، بۆی نەکرا ... لەسەرەخۆ کاغەزەکانی پێچایەوەو بە ڕەوانیو بێگرفت عوزر خوازی لە خەڵقەکە کردو گوتی نەخۆشی زمانیم هەیە وا ئێستا گرتمیەوەو لێناگەڕێ گوتارەکەم بخوێنمەوە ببەخشن . گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی د.انیشتبوو بێ ئەوەی کەس هەستی بە خۆداشکانەوەی لێ بکات وە یا ئەو تێمانەی لێ بەسەربگرێتەوە . لە لای خۆمەوە زاڵ بوونی دڵدار لەو دەمەدا بەسەر شەرمو بەخۆدا شکانەوەی زمان نەگەڕانی دەمی گوتاری خوێندنەوەی نێو کۆبوونەوەیەکی ئەوتۆییدا گەلێك ئازایانەو ئازادانەترە لە خوێندنەوەی لووسو لێكو بەتینو تەوژمی گوتاری نیو سەعاتیو دوو سەعاتی لەو دەمەدا من لە جیاتی دڵدار موچڕکم پێدا دەهات دەزانم دڵدار دەیتوانی بێنووسینەوە لەو موناسەبەیەدا بدوێتو زمانیشی نەگیرێ بەلام بە لای کەمەوە دووتێبینی خستیە سەر پەسندکردنی گوتار ئامادەکردن : تێبینی یەکەم ئەوەیە کە بە گەورەگرتنی ئاهەنگەکە لێی دەوەشێتەوە گوتاری بۆ حازر بکرێ . تێبینی دووەم ئەوەیە دەشێ گوتاری ئامادە نەکراو هەموو جاران نەگاتە پایەی ئەو موناسەبەی تێیدا دەگوترێ ، پایەی باوکیشم لای دڵدار ژووررووی هەموو حیسابێکەوە بوو . بە داخەوە نەمزانی ئەوگوتارەی چی لێ بەسەرهات ئەو «٤» ساڵەی بەیەکەوە خوێندنمان لە حقوق بە تێکڕاییو «٢» ساڵی بەیەکەوە ژیانمان لە ژوورێکدا بەتایبەتی ، هێندەی لە ژیان وئەدەبو شەخسیەتی دڵدار شارەزا کردووم بتوانم بە درێژی لەسەری بنووسم بەلام لێرەدا وەرامی پرسیار لەبارەی چۆنیەتی ژیانی ئەو چەند ساڵەی دەدەمەوە نەك تۆژینەوە لە باسی (دلدار) دەکەم چی لەو ڕووپەڕانەش خرانە بەرچاوی خوێنەرەوە بایی وەرامەکە دەکات بەلام ماوەتەوە تێبینیەکی دوایین لە بارەی فۆرمی شەخسیەتی دڵدارەوە دەربڕم کە تەعبیر لێدانەوەی ئاسان نییە زۆر جارانیش خۆمم بەو شیکردنەوەیەوە خەریکاندوە بۆ ئەوەی هەر نەبێ لە شێوەیەکی مەفهوومدا پەراوێزێك بە دەوری وێنەی نەقش بەستووی تەماوی و نامۆی شەخسیەتی دڵدار لە هەستمدا بکێشم بەلام وەك بمەوێ جیوە بگرم ، هەر جارە وستبێتم پەراوێز بە دەوری ئەو خوولیایەوە بکێشم خوولیا بلاوەی لێکردوە .. دڵدارم بۆ دەردەست نەکراوە لەبەرچاوی زەینمدا دڵدار پەردەیەکی تەمومژی بەدەورەوە

بوو نەیدەهێشت هێندەی مرۆڤی ئاسایی بۆ بینەر ئاشکراو خۆش خوێن بێ . چەندێکی لەگەڵیدا ژیابێتم و ووتوویژم لەگەڵدا کردبێت و لەیەکدی نزیک کەوتبینەوە زانیوەتم ئەمەی دەیبینم و دەیبیستم هەموو «دڵدار» نییە : پشکێکی حەقیقەتی دەردەکەوت کەوا هەرگیز بایی لێشارەزا بوونی تەواوی نەدەکرد هەستم دەکرد ، پشکی شرایەوەی دڵدار بە خۆی و نهێنییەکانییەوە ، وەها ڕاپێچەکی قوژبنە حەشارەکانی نەفسی دڵدار ئەراون بوونەتە بوونەوەری سەربەخۆ کەوا ڕەنگە لە فەرمانی دڵداریش دەرچووبن . بەلای باوەڕی ئەوساو ئێستاشمەوە .

کردنەوەی دەرگا داخراوەکانی ئەو ژێرزەمینانە کاری پسپۆڕی سایکۆلۆجی بوو بە مەرجێك دڵدار خۆی یارمەتی کرانەوەیانی دابایە . هەرگیز دڵدار لەخۆوە پتر لە نیوەی حەقیقەتی خۆی دەرنەدەخست وەیاخود پێی دەرنەدەخسترا هەرچەند دەیزانی ، ئێمەی برادەرانی ئاگاداری ئەحواڵی هەین نەیدەگوت برسیمە ، نەیدەگوت سەرمامە نەیدەگوت موفلیسم ، نەیدەگوت بێئومێد عاشقم ، نەیدەگوت فلانە ڕەفتارم لەگەڵدا مەکەن ، نەیدەگوت دڵم بدەنەوە دەردی هەرە قووڵی ناو دڵی بەزماندا نەدەهات ، حەزی لە شتێك کردبایە بە خامۆشی وبێئەوەی لە چاوان بچەقێ خشکەی بۆ دەکرد . بەڵام دەبێ بزانین کە ئەم حاڵەتەی نامۆیی و تەماویەتی لە دڵداردا نەبوو بوە نەخۆشی مەگەر نەخۆشیەکەی زمانی بدەیتەوە بەو حاڵەتە . ئینجا کە بە دواکاتەوە لە مەرگی ناکاتی ڕادەمێنم دەبینم ، یا بە ڕێکەوت یا بەداخوازی بڕیاری واقیع ، جوانە مەرگ بوونی دڵدار ئاکامێکی گونجاوە لەگەڵ نامۆیی تەمومژدا چونکە ئەو تەرزە حاڵەتە بەردەوام بوون هەڵناگرێ : نهێنی لەگەڵ تەمەنی درێژدا ڕێك ناکەوێ . دڵدار بەشە یادداشتەی وا بڵاودەکرێتەوە ئەگەر چەند پەردەیەکی ژیانیشی بە نەکراوەیی گل دابێتەوە ، هێندەی هەڵڕشتوە سایکۆزان کنەی تێدا بکات بەرەو ئەو هۆیانەی کە پەنامەکیەتی لە دڵداردا کرد بە پێکهێنەرێکی شەخسیەتی وەك کە د.عەلی کەمال لە ڕێی شیعرەکانی «متنبی» یەوە بەرەو دۆزینەوەی گرێی (ئۆدیپ) لە نەفسی «متنبی»دا ڕۆیشت . دڵداری خاوەنی «ئەی ڕەقیب»و «خەندەکەی بایی» تۆژینەوەی ئەوتۆیی لێ بەزیاد ناگیرێ .

بەغدا ٤/١٢/١٩٨٢

«مەسعود محەمەد»



دڵدار کاتی قوتابی‌یەتی کولیجی حقوق، ڕاوەستوەکان لە ڕاست بۆ چەپ -
مەجید ڕەئووف‌دڵدار ، مەحموود جەمیل .

دانیشتوەکان ڕەشید بلجەلان ، ئاسەف ڕەئووف

# کۆیەو
# (دواهەوار)

دڵدار کە کولێجی حقوق لە ۱۹٤٥دا تەواو دەکات ، لەگەڵ ئاسەفی برای کە ئەوسا لە کاروفرمانی میری دوور خرابۆوە پێکەوە لەشاری کۆیە نیشتەجێ بوون . وە لەوماوەشدا بێ وەستان و حەسانەوە دڵدار هەر خەریکی پارێزەری و خوێندنەوەو نووسین بووە ، زۆر خەڵك ڕووی تێدەکرد ، بەڕاستی پشتیوانی پیاوی بێچارەو خەڵکی ڕەش و ڕووت بوو ... جگە لە کۆیە زۆر دەعواش لە ڕانیەو قەلادزەو هەولێرو دەرەوەی هەولێر دیوە ، ئەوانەی یاساناس و حاکم بوون ، ئەوکات پێی لێدەنێن کە دڵدار لە یاسا زۆر شارەزاو پارێزەرێکی بەتواناو سەرکەوتوو بووە ...

وە سەرەڕای ناتەواوی باری تەندروستی و خەریکبوونی بە پارێزەری و بە سیاسەتەوەش ، لەگەڵ ئەوەشا چەند بابەتێکی ئەدەبی نایاب و هەندێ بەرهەمی شیعری جوانیشی بووە ... لە بەهاری ساڵی ۱۹٤٨دا کاربەدەستانی میری داوایان لە دڵدار کرد کەببێ بە (مدیر ـ ناحیە)ی سەنگەسەر ، بەومەرجەش لەوێش دانەنیشێ و ببێتە وەکیل قایمەقام لە ڕانیە ... هەرچەندە ئەو تەرزە وەزیفەیە بە تایبەتی ئەوکات بە پایەکی بەرزو دەسکەوتێکی گەورەی شەخسی دادەندرا ، لەگەڵ ئەوەشا دڵدار ئەو داواکاریەی میری بە لاوەناو نەی کرد ... چونکە وەك گوتمان دڵدار بۆ زاتی خۆی نەدەژیا هەمووکات و گیانی خۆی بۆ بەرژەوەندی دواڕۆژی نەوە دواکەوتووەکەی تەرخان کردبوو ...

لە ئەیلولی هەمان ساڵدا واتە (۱۹٤٨) «ئاسەف» ئەو برایەی کە جێگای باوکی بۆ گرتبۆوەو پشتیوانی سەردەمی مندالی و ڕۆژانی هەرزەکاری بوو ، کتوپڕ لە تەمەنی «٤۲» ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات .. ئەوکارەساتە خێزانیە زۆر کار دەکاتە سەر دڵدارو باری ژیانی زیاتر قورس دەکات ئەگەرچی بەسەرخۆیشی نەیناوەو دەری نەبڕیوە .

جا لە ڕووی خۆشەویستی و وەفاوە بۆ مندالەکانی کاکی بوو بە باوکێکی میهرەبان و دەستی سۆزی بەسەردا گرتن .



دڵداری پارێزەر ئەمەش دووا وێنەیەتی لە ژیاندا

## کـۆچی دووایی

پاش تەواوکردنی کۆلیجی حقوق واتە لە ساڵی ١٩٤٥دا مەرگ تەنیا سێ ساڵ ماوەی ژیانی دلداری داوە .

ئەو سێ ساڵەش خەریکی پارێزەری (محاماة)و خوێندنەوەو نووسین بووە لەگەڵ نەساغیشا هەر ئاشنا بووە بەتایبەتی دوو نەخۆشی (ڕۆماتیزم و ئاوسانی دڵ) بەردەوام ئازاریان داوە .

لە ڕۆژی ١٢/١١/١٩٤٨ کە تازە لە نەخۆشیدا ڕاست ببۆوە لەکۆیەوە بۆ هەندێ کاروباری خۆی دێتە هەولێر ، لەگەڵ کاک (عومەر حەبیب) دا لە یانەی فەرمانبەراندا نان دەخۆن و دەچنە سینەمای (حەمرا) لە گەڕانەوەدا لەنزیک ئوتیل (فەرەح) برادەرەکەی لادەداو دلداریش بە شەقامی (مظفریە)دا بەرەو تەیراوە شۆڕدەبێتەوە بۆ ماڵی سەعدی برای . کە دەگاتە ڕاست ئوتیل (کوکب الشمال) ڕەت دەباو دەکەوێ ، بەهەرباریێك خۆی دەگەیێنێتە چایخانەکەی بن قەلاتێ و ڕادەکشێ ، تومەز بە خواردنەکەی یانە کە (میمبەری سوورەوەکراو) دەبێ (تەسەموم) دەکات ، خەڵقەکەش وایان زانیوە سەرخۆشە بە عەرەبانە دەیبەنە خەستەخانە ، بەلام بێبەختی دکتوری (خەفەر) ئەوشەوە لە ماڵی دۆستێکی خەریکی مەی خواردنەوە دەبێ بەسەری ڕاناگات ...

ئەوە بە گوێرەی دیوانە چاپکراوەکەی - چاپی کوردستان - بەلام لەلایەکی ترەوە کاك موستەفا عوزیری بە جۆرێکیتر باسی بۆ کردم و گوتی :-

«دلدار لەگەڵ (عومەر حەبیب)ی[24] برادەری پاش چوار پێنج سەعات ماندی بوون و سەرما چێشتن بە درەنگ وەختێك لە کۆیێیەوە دەگەنە هەولێر ، ئێوارەی ئەو ڕۆژە من چاوم بە دلدار کەوت پێم گوت : بامیواندارێت بکەم و بچین

بۆ سینەمای سەلاحەدین گوتی : بەنیازین لەگەل کاك عومەر بچینە سینەمای (حەمرا) ... ئیتر وەك لەپاشا زانیم دوای ئەوەی ئێوارە لەیانە نان دەخۆن کە (میمبەری سوورەوەکراو) دەبێ دەچنە سینەمای ناوبراو ، بەلام پێش ئەوەی فلیمەکە کۆتایی بێ دلدار دلی دەگوشرێ و دێتە دەرەوە ، وا ڕێکەوت ئێمەش فلیمەکەی سینەمای سەلاحەدینمان بە دل نەبوو زوو بێزار بووین و بـەجێمان هێشت ، کاتێ بەرەو مال دەهاتینەوە غەربە غەرب و قەلەبالغێکی زۆر هەبوو کە پرسیم گوتیان : ئەوە پیاوێکی سەرخۆش کەوتیە ، هەرچەندە دلدار هەول دەدا بە خەلقەکە ڕابگەیێنێ محامییەو سەرخۆش نیەو نەخۆشە بەلام توانای ئەوەی نەمابوو سەرەرای زمان گیرانەکەشی کە کاتی ئاسایی هـەیبوو ، ویستم بچم بزانم کێیە ؟ هاورێیەکەم (ڕۆستەم جەبار) نەیهێشت گوتی : چیت داوە لەو هەرایە ... ئەوە بوو بەهۆی ئەوەی کە من ئەو دەرفەتەم لەدەست بڕوات و نەزانم ئەو نەخۆشەی بەسەرخۆشیان داناوە ئەوە دلداری شـاعیری هـاوڕێمەو لێی قەوماوە ، ئەگینا بەهەرباریك بوایە چارەسەریەکی وام دەکرد مەگەر خوا دەنا سەرئەنجامی بەوکارەساتـە نەهـاتباو منیش ئـەوەندە داخ و حـەسرەتـەم بۆ نەدەخوارد ...

بۆ سبەی لە خەلکیم زانی بەو عەرەبانەی کەکۆل هەلگرو حەممالەکان بەکاری دێنن دەیبەنە پۆلیسخانەی سەرا گۆیا سـەرخۆشـەو لەگەلی بکـەونە تـوژینەوە ، کـەچی (مفەوەزی خـەفەر) (ئیبـراهیم حەنـا) ئەوشـەوە لە مالی دۆستێکی خەریکی خواردنەوەو یاری پۆکەر دەبێ . دلداریش بەوشەوە ساردەی زستان بێکەس و بێچارە لەوێ دەمینێتەوە ، جگە لە ماندی بوون و سەرمای تری ڕێگای کۆیەو ناتەواوی باری تەندروستی و لەوانەشە خواردنەکەی یانەش لەبەر چەوری کەم وزۆر کاری تێکردبێ ، ئەوانە تێکرا هەمووی بـوونە هـۆی کارەساتی کۆچی کتوپڕی دلداری شاعیرمان ....

---

(٢٤) عومەر حەبیب عەبدوللا : ١٩٢٣ - ١٩٧٦ .
یەك لە ئاشناکانی دلدار بووە ماوەیەك پارێزەرو معاون تەسویە بووە لە سالی ١٩٥٩ بووە بە (حاکم) ئیتر تاکۆچی دوایی لەوە مایەوەو لەشاری کۆیە نێژراوە .



نووسەر لە سەر گۆڕی دلداردا

بۆهەمان مەبەست چوومە دوکانە شڕەکەی مام حەیدەری بۆیاغچی ، دیتم پیاوێکی بەناو سالآن کەوتەی لەسەرخۆ خەریکی پێلآو بۆیاغ کردن بوو ، دوای پرسیار لێکردنیو دواندنی لە بارەی چۆنیەتی ڕوودانی مردنی دڵدارەوە کە ئەوسا واتە لە ساڵی (١٩٤٨) دا شاگردی یانەی فەرمانبەران بووە وگوێیا خواردنەکەی دڵدار لە یانە خواردوویەتی ژەهراوی بووە ..؟ سەیرم کرد مام حەیدەر خۆی لەم مەسەلەیە گێل کردو تەواو ترسی لێنیشت ، وایدەزانی قوڵ پێچ دەکرێو دەیبەنە پۆلیسخانە !!.. زۆر بەنادڵیو پچڕ پچڕ چەند قسەیەکی بۆ درکاندم .. بەهەرباریێك ئەوەم لێ زانی کە لیژنەیەك لە ئەفسەرو پۆلیس دەچنە یانەو چێشتکەرو شاگردەکان دەبەنە سەراو لە گەڵیان دەکەونە تۆژینەوەو چێشتەکەش لە لایەن پزیشکانەوە تەماشا دەکرێت ، لەسەرئەنجامدا دەردەکەوێت خواردنەکەیان تێك نەچوەو ژەهراوی نەبووە) .

ئیتر ئەوە زیاتر ئێمەی خستە سەر ئەو بڕوایەی کە هۆی مردنی دڵدار تەنیا خواردنەکە نەبووە بەڵکو ڕاکەی کاك موستەفا عوزێری تەواو بەلای ڕاستییەوە چووە .

ئیتر بەم چەشنە لە ١٩٤٨/١١/١٢ دا لە هەرەتی شۆخیو لاویدا لە تەمەنی (٣٠ سی) ساڵیدا چرای پرشنگی ژینی ئەو شاعیرە دڵێرەمان دەکوژێتەوە ، ئەو دڵە مەزنە پڕئاواتو ئامانجەی لەلێدان دەکەوێتو ماڵ ئاوایی لەو خاكو هۆزەی خواست کە هێزی مێشكو دڵو زمانی لە پیناو ئازادیو بەختیاریانا بەخت کرد ، خاکی پاکی نیشتمانیش لاشەی لە گۆرستانی گەورەی هەولێر خستۆتە باوەش .. خۆم چوومە سەر گۆرە بێنازو تۆزاویەکەی .. چاوم بە دەوروپشتی گۆرستانەکەشدا گێرا ، لە دڕكو داڵو پوشو پەلاشو زەمەند چیترم بەرچاو نەکەوت .. خەیاڵ بردمی بۆ دوور .. بۆ وولاتی بێگانە ، بۆ ناو ئەو گەلانەی نرخی شاعیرو ئەدیبانیان دەزانن . کە چۆن بەیەکەری پیرۆزیانی لەگۆرەپانی شارەکانا بۆ دروست دەکەنو چوار دەوریان دەکەن بە دارو درەختو گوڵوگوڵزار هەموو ساڵێکیش یادی کۆچ کردنیان دەکەن ، ئاهەنگیان بۆ دەگێڕنو چەپکە گوڵی جوانو ڕازاوەیان لەسەر گۆڕا دادەنێن خۆ ئەگەر بڵێیت ئێمەش ئێمەی کورد تەنانەت بە چەپکە گوڵێكو ساڵی جارێك سەردانیش بەسەریان ناکەینەوە .. کەهیچی تێناچێت !! وەبگرە گۆڕیشیان بێسەرو شوێنە .. بەڕاستی کارەساتی کۆچکردنی ناوەختی دڵدار کوستێکی سەختی

ستەمکارانەی تری ڕۆژگار لە ڕاست نەوەی کوردا نیشاندا .. وە نەبێ ئەوکاتە ـ هەر بەوەش وەستابێ بەڵکو لە هەمان ساڵدا چەند ئەستێرەیکی پرشنگداری تر لە ئەدیبو شاعیرانمان لە ئاسمانی کوردستانا ئاوا بوون .. دەتوانین ساڵی (١٩٤٨) لە ساڵە نەحسو شوومەکانی مێژووی ئەدەبی کوردا بژمێرین : ئەمین زەکی بەگی : ئەدیبو مێژو نووسی بەرزی کورد لە ١٩٤٨/٧/١٠ دا ماڵ ئاوایی لێکردین .. پاش ئەو :

زێوەر : شاعیری بەهرەداری کورد لە ١٩٤٨/١١/١٠ کۆچی دوایی کرد .

دڵدار ، تەنیا دوو دۆژ دوای زێوەر لە میوانداری ژیان ماوەتەوە .

بێکەس : شاعیری مەزن پاش دڵدار مانگێکو شەش ڕۆژ واتە لە ١٩٤٨/١٢/١٨ ژیانِ بەجێ دێڵیو دەکەوێتە گەڵ کاروانی کۆچ کردوان .

زۆر لە نووسەرو ڕۆشنبیرو شاعیران بەمردنی کتوپری دلدار تاسانو کاری تیکرِّدنر هەستی دەروونیان بەشێوەی جۆراوجۆر دەربری یەك لەوان دڵزاری شاعیر بەم پارچە شیعرە پڕ سۆزە شین بۆ دڵداری جوانەمەرگی برادەری دەکاو دەڵێ : ـ

هەی ڕۆ کاکە ڕۆ کاك دڵدارم ڕۆ
هاوڕیی بە نرخو بەها دارم ڕۆ

شاعیری گەنجو پڕ شعوورم ڕۆ
ئەدیبی گەورەو بێ قسوورم ڕۆ

محامی گەلی هەژارانم ڕۆ
ڕێ نیشاندەری بێچارانم ڕۆ

دڵداری زاناو زۆر فەننانم ڕۆ
خاوەن بیری بەرزی جوانم ڕۆ

گەنجێکی پاکو پێگەیشتووم ڕۆ
هونەرمەندێکی تێگەیشتووم ڕۆ

لاوێکی ئازاو حەق پەروەرم ڕۆ
تێکۆشەرێکی کولنەدەرم ڕۆ

شەو چرای شەوی کوردستانم ڕۆ
هیوای دووا ڕۆژی نیشتمانم ڕۆ

گەنجی ڕەنجەڕۆو داخ لە دڵم ڕۆ
ئەسیری چاڵو چەوو گڵم ڕۆ

خونچەی نەشکوفتەی هەڵوەریوم ڕۆ
نەوجەوانێکی خێر نەدیوم ڕۆ

کۆچ کردوی پانزەی چلو هەشتم ڕۆ
یونس ڕەئووفی پاک ڕەوشتم ڕۆ

هەیرۆ کاکە ڕۆ کاک دڵدارم ڕۆ
هاوڕێی دڵزاریَ دل بە بارم ڕۆ(٢٥)

قانع شاعیری ناوداری کورد لە پارچە شیعرەکەیا لە ژێر ناوی (شیوەن بۆ پیرەمێرد) بە دوو دێر شیعری ناسکی پر سۆز یادی کۆچی دڵداریش دەکاو دەڵێ : ـ

دڵداری کۆیی نەوچەووزی لاوم
پەردەی تاریکی خستە سەرچاوم

# - خوو ڕەوشتی دڵدار -

دڵدار گەنجێکی سوورو سپی موو زەردو باڵا بەرزی میسری گۆشت بوو ، دوو چاوی گەشی نیگا تیژی هەبوو ، لە کاتی بیرکردنەوەو لێکدانەوەدا چاوەکانی وێل دەبوون وەلام لەمستو تابلێی قسە خۆش بوو ، زۆر جار لە کاتی ئاخاوتنا ینکتەو قسەی نەستەقی ئەهێنایەوە ، لە سەرەتای قسەکردنا زمانی دەگیرا ، بەلام کە دەکەوتە گەرمەی دواندنا کەم ڕێکدەکەوت بگیرێ ، هۆی ئەم زمان گیرانەش خۆی لە یادداشتەکەیا باسی کردوە .. سەیر ئەوە بوو نەیدەتوانی لەسەر کاغەز ووتارێك بخوێنێتەوە کەچی لە کۆبونەوەی زۆر گەورە لەبەردەم مێز رادەوەستا بۆ ماوەیکی درێژ (لەبەر) زۆر باش و ڕەوان دەدوا ، تەنانەت جارێك لە ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٨ داوای لێکرا کە هەردەبێ بە نووسین ووتارێك پێشکەش بکا ئەویش ووتارەکەی نووسی بەلام لە کاتی دەستپێکردنی ئاهەنگەکە سەیری کاغەزی نەکردو هەر لەبەر خوێندیەوە ، ئەو ووتارەش دوا بەشداربوونی بوو لە جەژنی نەورۆزی نەتەوەکەیدا .

دڵدار خەتو نووسینێکی جوانی هەبوو جگە لە زمانی کوردی کە زمانی نەتەوەکەیەتی ، زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی و ئینگلیزی زۆر باش و کەمێکیش فەرەنسی زانیوە ، لە نووسینی لاتینی شارەزابوە دڵدار جگەرەی زۆر دەکێشا ، لەگەڵ خواردنەوەشدا مەگەر جاروبار دەنا ئاشنایەتی زۆر نەبووە .. هەروەها ئارەزووی نیشان شکێنی و ڕاووشکارو چوونە دەشتو دەرو سەیرانی هەبووە ، لە هونەری وێنەکێشانیشا بەتوانا بووەو حەزی پێکردووە ، ئاوازی گۆرانی فۆلکلۆری بەتایبەتی لاوك و حەیرانی زۆر پێ خۆش بووە .. مەبەستی ئەم دوو دێر شیعرەی عەونی[٢٦] لە بارەی پەیوەندی کۆمەلایەتی یەوە یەکجار لا پەسند بووە ،

---

(٢٦) فارسی یەکەشی ئەمەیە : -

مەی بخور مینبەر بسوزان

مەردم ئازاری مەکون

که له بنچینه‌دا له فارسی وه‌رگیراوه :

نـویـژ مـه‌کـه رۆژو بـخـۆ عـاله‌مـیش ره‌نـجـیـده مـه‌کـه .
مـه‌ی بـخـۆ بـاده بـخـۆ فـیـکـری بـه نـادیـده مـه‌کـه .

دڵدار له کاتێکا قوتابی ئـاماده‌یی ده‌بێ له کـه‌رکوك شـه‌یدای کیـژێکی نازداری خزمی ده‌بێ ناوی « ... »[27] .

هه‌ست و سۆزی پڕجۆشی ئه‌ڤینی بۆ ئه‌و دلارامه وه‌ك کانیه‌ك له هۆنراوه‌ی « ئه‌ی بادی شه‌ماڵ » دا ده‌رده‌بێته‌وه ، به‌ڵام قه‌ده‌ریش واده‌کات که ئه‌م دوو دڵداره پێك نه‌گه‌ن ونه‌گه‌ن به ئاوات . دوای ئه‌مه که ده‌چێتـه به‌غـدا به‌پێی نووسراوه‌که‌ی مامۆستا مه‌سعود محه‌مه‌د « بهیه فرج الله » ش تـوانیویـه‌تی بچێته ناو گۆشه‌ی دڵی پڕسۆزی دڵداره‌وه‌وه ئه‌وعیشق و خۆشه‌ویستیه‌ی بۆ ئه‌و خاتونه شۆخه له شیعری « خه‌نره‌که‌ی بایی » دا خۆی ده‌رخستووه .. پـاش ئه‌مانه‌ش که خوێندنی ته‌واو کردو هاته‌وه کۆیه ، مه‌رگ ماوه‌ی نه‌دا ببێته خاوه‌ن ژن وماڵ ، به‌ڵام دڵدار هه‌رگیزاو هه‌رگیز له‌بیر ناچێته‌وه‌و ناوی له‌تۆی جگه‌ری جگـه‌رسـۆزی پـڕ ئـاواتی نـه‌وه‌ی کـورددا هـه‌ر ده‌مێنێ وه‌ك حـاجی قـادر فه‌رموویه‌تی : ـ

ئـه‌وی شـاعـیر نـه‌بـێ کـوڕه وه‌جـاغـی
له‌سـایـه‌ی شـیـعـره‌کـان بـابـی کـورانـم

دڵدار تابڵێیت لاوێکی کۆمه‌ڵ په‌روه‌رو ڕوح سووك و بێ فیز بوو به‌شداری هـه‌ست و نه‌ستی زۆربـه‌ی دانیشتوانی شـاری کۆیـه‌ی ده‌کـرد ، خـۆشیـان ده‌ویست و چووبوه ناو دڵیانه‌وه ، خاوه‌ن دڵێکی پڕسۆزو ناسك و دۆست‌په‌روه‌ر بووه ، ئاشنایه‌تێکی تایبه‌تیشی له‌گه‌ڵ باوکمدا هه‌بوو دێته‌وه یادم جارێك له ماڵی ئێمه دانیشتبوو دوو گه‌نجی ڕۆشنبیری تریش له‌وێ بوون ، له باره‌ی کۆمه‌ڵی کورده‌واریه‌وه ده‌دوان . دڵدار له‌سه‌ره‌خۆ خه‌ریکی پێچانه‌وه‌ی سیغاره‌یه‌ك بوو ئه‌وسا من له قـوتابخـانه‌ی سـه‌ره‌تایی بـووم ئه‌و بـاسانـه له مێشکمدا جێی نه‌ده‌بۆوه ، هه‌ر ئه‌وه‌نده‌م له‌بیره که دڵدار گوتی :

(به‌داخه‌وه ژماره‌ی دانیشتوانی کـورد له‌به‌ر شـه‌ڕو شۆڕو کـاره‌ساتی

(۲۷) ئه‌وخوشکه خاوه‌ن ماڵ و منداڵه . ناوهێنانی په‌سند نه‌کرا

زەمانە لە زۆر بوون نی‌یە ) .

دوواجار کە چاوم پێکەوت لە چایخانەیەکی خوار قەڵاتی هەولێر دانیشتبوو منیش لەگەڵ چەند هاورێیەکا لە چایخانە گەورەکەی حەسەن ڕەزای بەرانبەری بووین ، ئەوسا قوتابی خوێندگای مامۆستایان بووم ، دڵدار لەدوای ناردم ، کە چووم چۆنی‌و چاکیەکی گەرمی لە گەڵا کردم‌و لای دانیشتم .. جانتـایەکـەشی لەسەر لاتەختەکەی تەنیشتی دانابوو .. نیازی چوونە رواندوزی هەبوو .. پاش ماوەیەك گفتوگۆ چاوە شینە گەشەکانی تێبڕیم‌و زەردەخەنەیـەك گرتی‌و دوعـا خـوازی کرد .. ئیتـر هەر ئـەو دوعا خـوازیەو جـاریکی تـر چـاوم بـە دڵدار نەکەوتەوە .. کاتێك من میوانی بەندیخانەی (وەشاش) بووم لە بـەغدا ، ئـەو ساڵەش ساڵی (١٩٤٨) زستانێکی سەخت‌و پڕشەختەو بە بەفرو بـاران بوو . (ئەنوەر ئەدهەم) گەنجێکی سولەیمانی بوو هاتە لام‌و گوتی (نەتـزانیوە دڵدار کۆچی دوایی‌کرد) !!

لەکویە لە لایەن کاك عەونی حەبیبی شاعیر ئەم نامەیەم بۆ هات دەڵێ :

ئەو دوو پرسیارەی[٢٨] ئاراستەتان کردبووین دەربارەی خواڵیخـۆش‌بوو دڵداری شـاعیرو ئـەدیب وا بە کـورتی وەلامم دانەوە تکـایە دلگـیر مـەبن : دۆستـایەتی من‌و دڵدار لە سـەرەتاوە لەمـاڵەوە دراوسێ‌بـووین وەمن لەگـەڵ (ئاسەف) برای دڵدار زۆر دۆست‌بووین بەتایبەتی لەساڵی (١٩٢٥) کە لە کۆیە نیشتەجێ‌بو ، ئەمجا دڵداری ئەدیب‌و شاعیر پەیوەندی لەگەڵ مندا بەهێزتر کرد وە هەمیشە هاتوچۆی دەکردم دەهات بۆلام وەهەندێ جار پـارچە هـەڵبەستی دەهێنا نیشانی دەدام وە دەیپرسی پەسندی دەکەی یان‌نا ؟ جارجار پـەسندم دەکرد وە هەندێ جار ڕەخنەم لێ دەگرت ، بەلام ڕەخنەگرتنەکەی زۆر پێ‌خۆش بوو .. رۆژێك هات داوای لێکردم چەند پارچە هەڵبەست بە ماوبەشی بنووسین ، یەکەم هەڵبەستمان بەبۆنەی ڕووداوێکەوە ئەمەبوو : ئەوەی کەس بێ فەلەك دائیم لە خوێنی خۆی دەگـەوزێنی ، هەتـا دووایی ، وە چەنـد هەڵبـەستێکی دیکـەشمان نـووسی بە یـەکەوە ئـەمەبـوو سەرەتـای دۆستی‌و پەیـوەندی لە نیوانماندا .

وە بیروڕام بەرامبـەر دڵدار کە شـاعیرو ئـەدیب‌و نیشتمان‌پـەروەر کە دڵسۆزو بە بەزەیی وەکو هەموو کەسانێکی دیکە وایە . دڵدار مرۆڤێکی دڵپاك‌و

سادەو قسە خۆش و دەم بە پێکەنین بوو .. زۆر هیوای بە دواڕۆژی نەتەوەکەیەوە بوو . هەمیشە ئاواتە خوازی بەختیاری گەل و ئازادی نیشتمان بوو . هەتا بڵێی دووربین بوو . لە کۆڕی دانیشتن چرایێکی پرشنگدار بوو . لە دۆستایەتیدا بەوەفا و لێبوردو بوو ، لە بارەی شاعیری و مرۆڤی دڵدار : ئەوەی دیوانەکەی بخوێنێتەوە دەزانی شاعیریەتی دڵدار لە چی پلەو پایە دایە بەتایبەتی لە دووپارچە هەڵبەستدا :

یەکەم ، سروودی ئەی ڕەقیب دووهەم هەڵبەستی (لالە باس) ئەم دوو پارچە شیعرە بەتەواوی وەکو ئاوینە بیروڕای دڵدار لە هەموو ڕوێکەوە نیشان دەدا . دڵدار لە پلەی ژیانی یەکەمدا سەرکەوت ، بەڵام لە پلەی دووهەمدا دەستی ئەجەل یەخەگیری بوو ماوەی نەدا ، زۆر ئاواتی لەگەڵ خۆی بردە ژێر خاکەوە بەڵام وەکو حاجی قادر فەرمویەتی :

(مەرگ و ژین میسلی سێبەرو تاوە * ئەوەی باقی بمێنی هەر ناوە) لە جێگایێکی دیکە مامەندی کەرکوکی شاعیر دەڵێت :

بەری سەعی و فیداکاری گەلێ شیرینە وەك شەککەر
وەتەن پەروەر عەزیزو گەورەیە زۆر بەرزە عینوانی

کاك بورهان جاهیدی شاعیریش ئەم نووسراوەی دەربارەی بیرەوەری خوی لەگەڵ دڵدارا بۆ ناردم ـ

دۆستایەتی و ناسیاویم کاتێك لەگەڵ دڵدارا پەیداکرد کە خانوێکیان لە نزیك ماڵی ئێمەوە لە قەلاتی هەولێر بەکرێ گرت و بووین دراوسێ ، ئیتر لە هاتوچۆکردنی قوتابخانەدا گەلێ جار تووشی یەکتر دەبووین . سەیرم کرد لدوێکی تابڵێیت بەشەرم و ڕەوشت پاك و هێمن بوو ، لەبەرئەوە ڕۆژ بە ڕۆژ .. ئارەزووی پێك گەیشتن و دۆستایەتی لە دڵی هەردوکماندا زیاتر دەبوو .: هەرچەندە ئەوسا قوتابی بووین دەستمان لە شیعر نەدابوو ، بەڵام ماوەی سالێك تائەوان بەسەردا ڕۆیشتن ، هەرپێکەوە وەك برا زۆر بەخۆشی ڕامانبوارد .. لەو ڕۆژەوە کە لێك جودا بووین .. دڵدار نەمزانی چی بەسەرهات تا ئەو ڕۆژە لە ڕانیە لە ماڵی کاکەی سەعدی کە مەئمووری نفووس بوو لەوێ گەیشتینەوە یەکتری دوو شیعرمان پێکەوە دانا ..

یەکەم : ـ هەجوێکی شاعیرانەمان دانا بۆ خوا لێ خۆش بوو شاعیری ناسراو (کانی) کە (عبد الجبار ئاغای دۆغرەمەچی) مامەمە : ئەویش ئەمەیە : ـ

ئـەنـفـيـەت كـانـی دەڵێن مـسـك‌و گـولاوی تـێـكـەڵە
دار وەكـازیـشـت لە دارسـتـانـی گـونـدی هـەرتـەڵە

بـاش ئـەكـەی تـەقـلیـدی لەنـجـەی قـازی شـابـازە شـەلە
مـەیـلی ئـەشـعـارت وەكـو جـارانـە ئـایـا ئـەم حـەلە

هەتا دووایی ...
دووەم شیعر كە لەگەڵ دڵدار پێكەوە داماننناوە ، دێری یەكەم من‌و دێری دووەم ئەو دایناوە .. ئەویش ئەمەیە :
شـەهـبـازی یـاشـەهـێـنـی شـاهـی یـا شـەهـلاری تـۆ
بـێـدڵی بـێـمـروەتـی عـاشـق كـوژی خـویـنـخـواری تـۆ

ظالـمـی غـارەت گـەری تـالان بـەری بـۆگـیـان ودل
لەشـكـری تـاتـاریـە دوو زلفـەكـەی تـاتـاری تـۆ

هەتا دووابی ...
بەم جۆرە گەلی جاریش لە بەغداو كەركوك گەیشتوینە یەكتری و چەند رۆژێك پێكەوە ماوین ، باسی شیعرو ئەدەبی كوردیمان كردوە .. گـەلی ئاخ‌و داخـمـان هەڵیناوە بۆ دوواكەوتنمـان لەم بابـەتە . خـوا لێخۆش‌بـوو ئینسانێكی گـەلێ تێگەیشتوو نیشتمان پەروەر بوو رێزی لە هەموو لێقەوماوان‌و هەژاران دائەنا مرۆڤێكی زۆر بەوەفاو بەرەحم‌و خزم‌دۆست‌و دڵ نەرم‌و حەلیم بوو ، زۆر جـار بەزەیی بە حاڵی منا هاتووەو گریاوە بۆم .. چونكـە من لە ژیانـدا گەلی ئـازارم خواردووە لە دەس خزم‌و كەس . خوالێخۆش‌بوو هەزار رەحمەتی خوای لێبی خاوەن دڵێكی ناسك و بێ‌غەش بوو ، درۆو دەلەسە لای ئەم ئینسانە گەلی قەدەغە بوو ، بۆ ماڵ‌و سەروەتی دونیا هیچ هەوڵی نەئەدا .. داخی گرانم زۆر سوودی لە ژیانی خۆی نەدی ، كاسەی ئەجەل رووی تێكردو لە دەستمانی دەرچواند ..
هەروەكو من بەشیعر ووتوومە :
دڵدار (مـەلی) بـوو دەرچـوو لە دەسـمـان

بردی لەگەل خوّی مەیلو هەوەسمان

پاش ئەو ئینسانە ئێمە چوّن بژین
لەگەڵ کێ دانیێن شیعرو هەڵبەسمان

ئەو مەلە روّیی بوّ بەهەشتی خوّی
ئێمە ماینەوە بە دووای قەفەسمان

وەرە پێم بلێ دڵداری نازدار
منو توّ لە ژین چی بوو مەبەسمان

هەر هێندە نەبوو کە ئازاد بژین
بشکێنین هەموو بەندو قەفەسمان

وا توّ شکاندت دەرچووی بە شادی
منیش ئەشکێنم کەسمان لە کەسمان

لەژێر خاکیش بی (جاهید) هەرلاتە
دڵمان وەرئەگرێ دەنگی جەرەسمان

# « بیروڕای سیاسی دڵدار »

دڵدار وەنەبێ هەر بە سۆزو عاتیفەی ناسك وەیا بە شیعرو خەیاڵاتی پڕ ئاوات باری نالەباری پڕ تەنگو چەڵەمەی کوردی چارەسەر کردبێ بەڵکو وەك هەر ڕۆڵەیکی خەباتکەری تر هاتۆتە مەیدانی تێکۆشانی پڕ مەترسی سیاسی سەردەمی خۆی ، لە ساڵی (١٩٣٨) دا چووە پاڵ حیزبێ هیوا[٢١] وە بە هۆی زرنگو چالاکیو لێهاتوویی خۆی لە ماویەکی کەمدا بوو بە سکرتێری ئەو حیزبە . وە بەچاوی پڕ ڕێزو خۆشەویستی لە لایەن ئەندامانی سەرکردایەتی بە تایبەتی سەرۆکی حیزب (مامۆستا ڕەفیق حلمی) یەوە سەیرکراوە . هەوڵو کۆششێکی زۆری لە پێناوی پێش‌خستنو بەهێز بوونی ئەم ڕێکخراوە نەتەوەیی‌یە تازەیەکرد ، پێش کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی بە ساڵێك واتە لە « ١٩٤٤ » دا « هیوا » لەبەر هەندێ هۆی سیاسی تێك چوو .. وەلە ساڵی ١٩٤٥ بەتەواوی نەما ئەو تاقی‌کردنەوە سیاسی‌یەو بڵاوبوونەوەی بیروڕای نەتەوایەتی و پێشکەوتن خوازی لەناو گەلاندا بەتایبەتی پاش کۆتایی شەڕو لەناوچوونی بەرەی فاشیەتی کە کارێکی گەورەو گۆڕانێکی گرنگو بارێکی تازەی خستەکایەوە .. ئەمانەو ئارەزووی گەرمو گوڕی خزمەت کردنو بەردەوام بوون لە تێکۆشانا بوونە هۆی ئەوەی کە دڵدار ڕێبازێکی تری سیاسی بگرێو لە ساڵی (١٩٤٦) دا بچێتە ناو حیزبی (تحرر) و ، بوو بە ئەندامێکی کارامەو دیارو کوڵنەدەر . بەڕاستی ڕەوشتو کارو کردەوەی ڕۆژانەی دڵدار لەگەڵ جەماوەردا جێی شانازی هەموو کوردێکی خاوەن بڕوا بوو .. هەرگیز بە چاوی تەسکی حیزبایەتی سەیری خەڵکی نەکردوە .. ئەستێرەیەکی گەش بوو لەناو بەرەی نیشتمانی‌دا ، زۆر جار داندراوە بەسەرۆکی لیژنەی سەرپەرشتی کردنی ئاهەنگەکانی جەژنی نەورۆز ، بە زۆری ووتاری پێشەکیش هی ئەو بووە .. دڵدار هەتا بڵێیت گیان پاكو دڵسۆز بووە خۆبەخت کردنی گیانی بۆ نەوە چەوساوەکەی لا هەرزان بووە ..

پیرۆزبادی ئەم رۆژەتان لێدەکەم ، چونکە ئەم جەژنەیە هەر سەر بە کوردا نیە بەلکو جەژنی هەموو گیاندارێکە بریا لە نێو ئەم گیاندارانەدا ئادەمیزاد بەرامبەر بەمەرحەمەتی تەبیعەت هەستیان بە بەهەشتی ژیانیان دەکرد کە ئەم زەمینەو ئەم ژیانــە خودا بــۆ بەختیــاری داناوەو بــەهرەی ئــادەمیزادی بــۆ چاکــە پێ بەخشیوە .. نەك هەر ژیان بەویترو تال بکات .

ئیمرۆ هەموو جیهان بە چاوێکی پڕ ترس وئامانجەوە سەیری ئەم شەڕە ئەکات[٤٤] ئەیەوێ کــە لەشی پڕ زامی خــوێناوی لە ئــاسودەیێکی پــڕ خۆشیــدا بحەسێنێتەوە ، وا تارمایی زۆر بە دەستی دوشمنانی سەربەستی وەك هەوری زۆر چلکنی بەر ئاسمان هەلبرینگاو نەما دایکانی رۆڵە کوژراو خوشکانی برا نەماو خێزانانی مال تێکدراو ، هەموو لایەکیان گوێیان رایەڵ کردوە کە دووا تەقەی تۆپی شەر ئاوەر بدرێ ئەوەل ئاوازەی موسیقای ئاشتیان گوێ لێبێ ، گەلی ئادەمیزاد هەروەکو سالی تازەمان بەرەو بەرگیکی نوێ ژیانێکی ئاهەنگ ئامێز پەیرەوێکی راستی لە ویجــدان نێزیــك ئەروا . کــە هەر نــوقتەیــەی بە هــەزاران دلوپەی شەهیدانی بێ گوناه لە پێناوی ئەشخاسانی خاوەن ئایدیالی خراپەو قینە جوێیدا رۆیوە نووسراوەتەوە .

ئێمە کە لەم دونیایەدا وەکو هەموو لاێك (تتحسر) بە (خطام) دەکەین ، لەم رۆژە پیرۆزەدا نیازی زۆر گەرممان کــە لە دلێکی گەرمی بــەزولی ئادەمیــزاد موعەزەب هاتوتــە دەرەوە لە یەزدانی گــەورە ئەپــارێنەوە کــە شادی نــەورۆز بەهەموو دونیادا تاکو ئەبەد لەنێو پەروێزی ئاشتومانێکی زائیل نەبوودا بەرپا بکات ...

ئێتر سوپاستان دەکەم .

---

(٤٣) وا جوانتر بوو دلدار بلێت (بنەمالەی پێشدادیان) نەك ووشەی (طبقە) بەکاربێنی .

(٤٤) مەبەستی شەڕی جیهانی دووەمە ـ ١٩٣٩ ـ ١٩٤٥ .

# عمر خیام

شاعیری خۆش گوفتاری کورد «سەلام» چوار خشتی‌یەکانی خەیامی پێ‌بەپێ بەکوردی هەلگیراوەتەوە هەربەچوار خشتەکی لەگەلاویژدا بلاوی‌ئەکاتەوە ئەم کارە زەحمەتە وانەبی لە توانای هەموو کە سێکا بێ شیعر بە شیعر تەرجومەی کردو دەست لە بنج‌و بناغەی مەعنا ئەسلی‌نەدان عادەتەن دوو هێندی تەئلیفێك زەحمەتی پێوە ئەکێشرێ مرازم ئەمە نیە کە لەم نووسینەدا مەدحی «سەلام‌و» تەقدیراتی خۆمی نیشان بدەم بەلکو چوار خشتی‌یەکانی «سەلام» خۆیان مەدح‌و تەقدیراتی «سەلامن بەلام مرازم ئەمەیە کە «خەیام» بە خوێندەوارانی خۆشەویست بناسم‌و وێنەی ژیانی ئەدەبی و میژوخوی بە ووردی بەیان بکەم لە پێش ئەوەی کە بکەومە ناوئەم باسەوە ئەمەوێ کە حیکایەتێکتان بۆ بگێرمەوە «وائەگێرنەوە کە جارێك شەش کوێری زگماك لە هیندستانا تووشی فیلێك ئەبن . یەکێکیان ئەکەوێتە لای لوتی‌یەوە «خرتوم» دەستی لێ‌ئەدا ئەلێ «فیل‌بە عەزیایکی زۆر گەورە ئەچێ» دووەمیان دەست لە ددانی ئەدا ئەلێ «نا فیل لەگەل نێزە فەرق ناکرێ» سێ‌یەمیان کەوتبووە لاگوێ‌یەوە خۆی لە دووانەکەی پێشووی توورە کرد ووتی «ئەمە یەك کوێری نازیرەك بدینم» موناسەبەت چی‌یە ؟ فیل لە باوەشینە ئەکات عەزیای‌چی ؟ نیزەی چی ؟» چوارەمیان دەستی بە قاچەکانی کەوتبوو لە قاقای پیکەنینی‌دا ووتی «ماشا الله ، ماشا الله لەم عاقلانە» باوەشین و کۆلەکە زۆر لە یەکتر دوورن فیل بە کۆلەکە ئەچی» پێنجەمیان دەستی لە تەنگەی فیلەکە گیرا زۆر توورە بوو بەسەر ئەوانی تردا قیژاندی ووتی وسی وس ، شەرم ناکەن ئێستا چاو ساغێکمان لابایە وای ئەزانی هەموو کوێرێك وەك ئێوە کەم ئیدراکن ، ئەم ژاوە ژاوەتان لە چیە ؟ فیل هەروەك دیوارێك وایە برایەوە» شەشەمیان قسەکەی بری‌و زۆر پەست ببوو ووتی «باوکم ئێوە زۆر غەلەتن فیل نەبە عەزیا نەبە نێزە ، نەبە باوەشین ، نەبە کۆلەکە ، نە بە دیوار ئەچێ دەمت لە

گوریس بده . هەروەکو دەستت لە فیل دابی چ فەرقی نیە» فـەرقی نـیـە مـی لی ئـەوویس

بەکلکی فیلەکە کەوتبوو . جا ئەم شەش کوێرە لێیان بووە کەشمەکەش و قیرە قیر بەلام حیکمەتەکە ئەمە بوو هەموویان راستیان دەکرد وە هەمووشیـان درۆیان دەکرد . شاعیری شیرین گوفتار شێخ سەلام بەرە بەرە روباعیەتەکانی خەیامی هـەر بەشیعـر هەلگیـراوەتەوە ، واپێ دەرچێ لە گـوڤاری گـەلاویـژدا بـلاوی ئەکاتەوە . ئەم کاری وا زەحمەت وئەم هونەرمەندیە لە پیاوێکی هونەرمەنـدی وەك سەلام نەبێ نەوەشانەوەی لای هەموو کوردێك مەعلومە . کوردو زوبانی کوردی لەبەرئەوەی کە زەمانێکی زۆر دوورو درێژە کەوتووتە بن باری نیگبەتی و بەدبەختی ئەو ملوانکە گەوهەرینەی کە پێشونان بۆ ئێمەیان بەجێ هیشتوە کە ئەویش (ئەدەبیاتە) پساندراوو هەر دانەی پرژاوەتە لایێکەوە بۆ کۆکردنەوەی ئەم ملوانکەیە گەلێك کەس لەهەول و تەقلا دایە بەلام لە لاییکی ترەوەش وە نەبێ مێشکی کورد هەرچاوەنۆری ئەمە بکات ، تا ئەدەبیاتی کـۆنی خۆی بـژێنێتەوە ئینجا دەستکا بە ئینتاجی ئەدەبی تازە داکەوتوو بەلکو گەلێك لە شاعیرەکانمان تەك بە تەك مەدەنی یەتی حازرەو ئەدەبیاتی عەسری یەوە دەرۆن بێشك لەم کارە موبارەکەی دووایەدا کردەوەی شێخ سەلام کـە روباعیـاتی (خەیـام)ی مەشهوور دەکاتە کوردی ، لە هین هەمووان بەرزترە وەکـو رۆژێکی بەهـاری شەوق بەخش زۆر دلێرانە لە ئاسمانی کوردستان ئەبریقێتەوە ، ئەمەوێ کە لەم بابەتەوە تەقدیرات و مەمنونی یەتی ئەنـدێشانو ئـەدەبیات پـەروەرانی کورد پێشکێش شێخ سەلام بکەم بەلکو روباعیاتە کوردیەکانی خەیام لە کوردستاندا هێندەی روباعیاتی ئینگلیزی خەیام کە لەلایەن (فیتز جرالدەوە) هۆندراوەتەوە حەقدەرو روح پەرەیە .

خەیام ، تا ئێستا لە کوردستاندا هەروەکو لە جێگایانی تردا ناسراوە وا نەناسراوە ، بەلکو ئەم ئەستێرە بەرزە هەموو شوێنێکی رووناك کردۆتەوە هێشتا بـە چاکی تیشکـەکانی دۆل و شیـوو ئەشکـەوتەکـانی کـوردستـانی روونـاك نەکردۆتەوە ، بەلکو (اعتقاداتی) دینیەو شوهـرەتی (خەیـام) بەمـەی پەروەر وکوفر ئامیزی بویتە باعیسی ئەمەی کە ئەم لە کوردستاندا وەك نـەناسـراوبی وابێ . تالەم رۆژانەدا رۆژێك بە موناسەبەتی باسێکی فەلسەفی بەسەر سەرەکی ناوی خەیام هاتە ناوەوە ، (فەقێکی) توورە زۆر بە ئیفتیخارەوە هیـچ شەرمی

نەکرد ووتی «خەیام بە لەعنەت بی» هیچ لەگەڵ مورتەدان فەرق ناکـریٚ هەر چەندیٚکی کەس گوییی نەدایە ئەم هەلەوەریە بەلام گەر ئەم کابرایە لە مەجلیسیٚکی

تر ئەم قسەی بکردبایە ، ئەم قسانەی خوٚی تەرەسوخ پیٚدەکـرد ، ئەمـەش دەلیلی دەرەجەناسینی (عومەر خەیام)ی مەشهووره لەناو زومـرەی زوٚرترینی تیٚنەگەیشتووان و تازه چاوهەل هاتووانی کوردا . بەلیٚ وە نەبیٚ (عومەر خەیام) هەرچەندیٚکی فەیلەسوفیٚکی شەرقی خاوەن میٚشکیٚکی زوٚر ووردی ئیٚرانیی‌یە تا بەم دووایی‌یە نەبیٚ کە لە لایەن موستە شریقەکانی روٚژئاواوە ئاشکراکرا کەس نەیدەناسی . وە ئەم تەختە بەرزەی بوٚدروست نەکرابوو ، چونکە عەسەبی‌یەتی دینیو شوهرەتی خەیام بەلەدین دەرچوونو لەلایەن دوژمنەکانی‌یەوە لەوەختی خوٚیدا پروٚ پوٚغاندەییٚکی زوٚر لە (عەلەیهی) کردن بووە سەبەبی ئەمە کە خەیام لە لایەن هاو وو لاتو هاوزوبانی‌یەوە ناوی نەیٚتە نـاو ناوان . تـا دکتوٚر عبـدالله جەودەت بەگ لە دیباجەی تەرجومەی روباعیاتی (خەیام)دا حادیسەییٚکی زوٚر ئەنگیٚنری) نووسیوەتەوە کە دەلیٚ برادەری خوٚشەویستم خەلیل خالید بەگ لە میستەر براون (M — Browne)ی بیستوە کە ئەو وەختەی (مظفر الدين) شـاه لە ئاورپادا گەشتی دەکرد لە (لەندەن) وەفدیٚکی لە (جەمعیەی عومەر خەیام)ی چوو بووە لا کە داوای موساعەدەی ئەمەی لیٚبکەن کە مەرقەدەکەی زوٚر جوان هەل بندریٚتەوە ئەم وەفدە دەستیان پیٚکرد کە زوٚر موقەدەسانەو تەقدیرانە . ناوی عومەر خەیام ببەنو مەکانەتی زوٚر بەرزی عومەر خەیام لە بەینی میلەتدا عەرزی شاه بکەن کە لە گـوفتارەکـانی خوٚیـان بوونـەوە ئینتیزاری تـەشکور نامەییٚکی گەرمیان لە حەزرەتی شاه کردبوو ، بەلام شاه رووی‌کردبووە (رئيس الوزراء)ی ئیٚران کە لەگەلی بوو وەپیٚی ووتبوو «ئاقا این عمر خیام چەخریست» یەعنی ئاغا ئەو عومەر خەیامە لە چ تیرەییٚکە ؟ بەمە ئیزهاری جەهلو وەفدەکەی خستبوە دەریای حیرەتەوە . ئەگەر شاهیدی ئەم مەسئەلەیە (میستەربراوان)و (خەلیل خالید بەگ) نەبووایە لە بابیٚکی کە خاوەنی ئەم قیتعە شیعرەی کە دەلیٚ :ـ

«أز مشبکهای رنگارنك پك پرتو فدات
«کفرو دین ، دیرو حرم شد مبشد زنارشد
«ساقی روزی ازل چون جرعەی برخاك ریخست
«تاك شد انکور شدمی شد نصیب یارشد .

که هێنده وردو نازك‌و بالاو شاعیرانه‌یه ئه‌م زاته به‌رزه کوڕێکی هێنده بێ جه‌وهه‌رو که‌و ده‌نی لێ بووبێ هیچ باوه‌رنه‌ده‌کرا .

له‌مه‌وه وادیار ده‌که‌وێ که تا وه‌ختێکی زۆر نێزیك هه‌تا شازاده‌کانی ئێرانیش که عاده‌ته‌ن زۆر ئه‌دیبانه‌و به‌سه‌قافه‌تێکی قه‌ومی په‌روه‌رده ده‌کران خه‌یامیان نه‌ناسیوه وه ئه‌مه‌ش هه‌موو سووچی ئه‌م ئاوه پیسانه‌یه که دوژمنه‌کانی بۆیان ڕێشتووه . وه یاخود ئه‌مه‌یه که عومه‌ر خه‌یام له وه‌ختی خۆیدا شووره‌تی به شاعیر وه‌رنه‌گرتووه وه ئه‌م روباعیاتانه‌ی که هه‌یه ئه‌غله‌بی به سووره‌تێکی (عرض)و له موناسه‌باتدا یان (ئیرتیجالیه‌ن) و تێبیش نه‌بوویته سه‌به‌بی ئه‌مه‌ی که ناوی بکه‌وێته ریزی شاعیرانه‌وه تا (ده‌وله‌ت شاه) له کتابه‌که‌ی که ناوی (ته‌ئریخی ئه‌ده‌بیاتی ئێرانی) یه ناوی خه‌یامی زۆر به‌سه‌ر سه‌ره‌کی بردووه . یه‌عنی ئه‌م زاته به شاعیرێکی خاوه‌نی ئه‌و میهنه‌ته‌ی نه‌ناسیوه ، باله‌م بابه‌ته‌وه چیترلێ‌ی نه‌دوێن ، چونکه ئه‌گه‌رینه‌وه سه‌ری .

به‌گوێره‌ی ئه‌م ته‌دقیقاتانه‌ی که دکتور «کریسته‌نس» له موقه‌دیمه‌ی ته‌رجومه‌ی روباعیاتی خه‌یامی‌دا نووسیوویه‌تی سالی (١٩٠٥)م (عمر خیام) ناوی به‌ته‌واوی (غیاث الدین عمر ابن ابراهیم الخیامی) یه له سالانی (١٠٢٥٦ ـ ١٠٥٠) میلادي له نیشابور (که شارێکه له خوراسان له دایك بووه) . ئه‌م ته‌دقیقه زۆر ئیختلاف له‌گه‌ل ئه‌م وه‌ختانه هه‌یه که موئه‌ریخینی پێشوی رۆژهه‌لات ، چونکه ره‌زا قولی خان هیدایه‌ت له کتابه‌که‌ی ناوی (مجمعی فصحاء) یه ئه‌لێ خه‌یام له سالی (٥١٧)هـ وه‌فاتی کردووه یه‌عنی ئه‌بێ له‌سالی (١٠٩٩م) وه‌فاتی کردبێ . ئه‌حمه‌دی کوری عمری کوری عه‌لی (ئه‌لنیزامی العروض) که قوتابی خه‌یام بووه له کتیبه‌که‌ی که ناوی (جهار مقاله) یه ئه‌لێ : له‌سالی (٥٣٠هـ) زیاره‌تی قه‌بره‌که‌یم کرد ئه‌وساکه پێ‌یان ووتم : که ماموستایه‌که‌م چوار سال له‌مه‌وپێش وه‌فاتی کردووه . به‌م گوێره‌یه ئه‌بێ له‌سالی (٥٢٦ هـ) وه‌فاتی کردبێ که ئه‌بێ له‌سالی (١١٠٨)م وه‌فاتی کردبێ وه هه‌روه‌کو دکتۆر عبدالله جه‌وده‌تیش ئه‌لێ له‌سالی (١١٢٣)م له (مرو)دا وه‌فاتی کردووه به‌عنی ته‌سادوفی سالی (٥٤١) هـ ده‌کا ئایا له‌م سالانه کامیان ڕاسته ؟ .

هه‌رچی (دکتور عبدالله جه‌وده‌ته) به‌گوێره‌ی ته‌دقیقاتی (دکتۆر کرستیه‌نین) ده‌ڕوا ئه‌گه‌ر ئه‌م موده‌ته‌ی که (کریسته‌نس) داناوه که له‌به‌ینی

سالانی (١٠٢٥ ـ ١٠٥٠) میلادیە بگریتە پیش چاو بەگویرەی تەقدیری دووایی کە (١٠٥م) یە ئەبێ عومری (٧٣) ساڵ بووبێ ، نا ئەگەر بەپێی تەقدیری یەکەمی بی ئەبێ عومری لە (٧٣) سالان تێپەڕیبێ . خاوەنی (مجمعی الفصحاء) کە رەزا خان هیدایەتە ئەڵێ :ـ لەسالی (٥١٧) وەفاتی کردووەو بەدەلالەتی ئەم روباعیەی کەدەڵێ :ـ

هرگز دل من ز علم محروم نشد
کم ماندز اسرار مفهوم نشد
(هفتادو) سال عمر کردم شب و روز
معلومم شدکە هیچ معلوم نشد

تەرجومەکەی بە کوردی ئەمەیە : «دلی من هیچ وەختێك لە عیلم بێ بەری نەبووە کەم ئەسراری وابووە کە تێنەگەیشتبم ، حەفتاو دوو سال عومرم رابوارد شەو روژ لێم مەعلووم بوو کە هێشتا هیچم لێ مەعلووم نەبووە ٧٢ سال ژیاوە جا (٧٢ ـ ٥١٧ = ٤٤٥) لە دایك بووبێ کە تەسادوف (١٠٢٧)م دەکا . بەمەوە قسەی رەزا قەولی خان هیدایەت زۆر نێزیکی بەیاناتی (دکتۆر کریستەنسن)ە کەئەڵێ : لە (١٠٢٥) لە دایك بووە . وە ئەگەر بە گویرەی ووتاری (نیزامی ئەلعرووز سەمەرقەنری) کە ئەڵێ لەساڵی (٥٢٦ هـ) وەفاتی کردووەو عومری خەیام بە ٧٢ سال تەقدیر بکەین ئەبێ لەساڵی (١٠٣٦) لە دایك بووبێ ، بەلام ئەم دەلیلەی کە بەدەستەوەیە کە ئەڵێن (٧٢) ساڵ ژیاوە وە ئەویش ئەو روباعیەیە کەوا عەرزمان کردووە ئایا بە دەلیلێکی مەقبوول لە قەلەم ئەدرێ یان نا ؟ بۆ ئەمەی کە ئیعتوباری پێ بکرێ ئەبێ دیسان ئەمەش بزانین کە خەیام لەو ساڵەی کە ئەم روباعیەی ووتووە و لە عەینی سالدا وەفاتی کردووە ؟ بۆ ئەمەش هیچ ئیستینادگامان بەدەستەوە نیە . بە چ مەعلوم خەیام لە پاش ئەو روباعیە دە سالی تریش نەژیاوە ؟ لەبەر ئەمە تەئریخی لە دایك بوونی خەیام هەروەکو لە پیش چاوتانە شتێکی مەجهوولە و بە روێکی تەقدیری یەوە باس دەکرێ . ئەم مودەتەی کە دکتور کریستەنسن دایناوە کە لەبەینی سالانی (١٠٢٥ ـ ١٠٥٠م) لە دایك بووە عیبارەتە لە (٢٥) سال مودەت بۆ ئەمەی ببێتە مەیدانی تەقدیر بۆ لە دایك بوونی شەخسێك شتێکی زۆر نامەنتیقیە . لەبەر ئەمەی کە (عروزی

سەمەرقەندی) خۆی خەیامی دیتووە و زۆری خۆش ویستووە . بەلکو (خەیام) مامۆستای بووە وابزانم لە تەقدیری تەئریخی‌و وەفاتیدا زۆر بەهەلە نەچووە بەلکو راسترینی وەختە بەلام لەبەرئەوەی کە تا ئێستا بەراستی نەزانراوە کە خەیام چەند ساڵ ژیاوە ، هەروەکو بەیانمان کرد . ئەم روباعیەی کە (رەزاقولی‌خان) ئەیلێ دەلیلێکی زۆر بە قوەت نیە ئەتوانین کە هەر عەینی روباعی بە ئەوەل محاوەلەی تەقدیری عومری (خەیام) دابنێین وبلێن خەیام هەر (٧٢ ـ ٨٠) سال ژیاوە بەمەوە سالی لە دایك بوونیشمان بە سوورەتێکی مەنتیقی پێ تەقدیر دەکرێ کە مومکینە خەیام لە بەینی سالانی (١٠٣٦ ـ ١٠٤٤م) لەدایك بووبی کە تەسادوفی (٤٥٤ ـ ٤٤٦هـ) دەکا . وەشوێنی لەدایك بوونی (خەیام) دیسان لە موجادەلەیە هەروەکو حسین دانش‌خان لە تەرجومەی خەیامدائەلێ :ـ

خاوەنی (تەئریخی الألفی) کە (ئەحمەدی کوری نصر الله تتوی) یە ئەلێ لە گوندی «شمشاد» کە تابیعی شاری (بەلنجە) لە دایك بووە (ص ٤٣) هەند ێکیشیان ئەلێن لە گوندی (بسنك) کە لە مەنتیقەی ئەستراباده لە دایك بووە . بەلام (شەهرەزوری) قەزوینی خواندمیر ئیتیفاقەن ئەلێن کە نیساپور ـ نیشاپوور) لە دایك بووە . وەئەمەش راسترینی[٤٥] شوینانە (یاقوت الحموي) لە کتێبەکەی کە ناوی (معجم البلدان)ە باسی شاری نیشابور ئەکا وە ئەلێ (شارێکی زۆر گەورەیە سەرچاوەی ئەقل مەندان‌و زانایانە ، پیاوی زۆر گەورەی لێ‌هەل کەوتووە . لە ژیانی خۆمدا شاری وهام چاو پێ‌نەکەوتووە . خەلقی نیشابور بە لولە کۆزکان ئاو ئەبەنە ژێر ئەرزەوە و لەژێر زەمینەکانی خانوەکانیاندا ئەیخۆنەوە ، هێندە ئاوی شیرینە کە وەختە بلێم باوەر ناکرێ هەروەکو ناسیبیتم زۆر خاوەن میوەو خێرو بەرەکەتە چەشنە (ریواسێ) ێکیان هەیە کە لە دنیادا شتی وانیە !!

وادیار د.ەکەوێ کە نیشابور شارێکی عیلمی‌و عولەمای زۆر لێ‌پێ گەیشتووە . تا هەروەکو دکتور عبد الله جەودەت دەلێ : وا شورەتی سەندبووکە هەر کەسێك لە نیسابور لەلای (موفق الدین عبداللطیف النیسابوری) دەرس بنحوێنی ئاخری زۆر خێر وئەبێتە پیاوێکی گەورە لەبەر ئەمە دەستە دەستە خەلق روویان لە نیسابور دەکرد بۆ خوێندن زۆر کەمیان وابوو کە هێندەی بەخت هەبێ لای (موفق الدین) دەرس بەربکەوێ (ص ٩٩٠) (میر خند) لە زوبانی

(نظام الملك) دا ئەگێریتەوە ـ کەوامەشهوور بووەکە هەرکەسێك لای (موفق الدین) خوێندبیتی ئەبێتە پیاوێکی گەورە لەبەرئەمە باوکی ـ یەعنی باوکی (نظام الملك) ئەوی ناردۆتە نیسابور بۆ خوێندن کە چووە دوو فوتابی تری زۆر زیرەکی لاچاو پێکەوتووە کە یەکیکیان (خەیام)و ئەویتریشیان (حسن الصباح) بووە . هێندەی پێنەچووە کە (ابو القاسم) کە (نظام الملك)ە لەگەلیان بوویتە دۆست ، رۆژێك هەرسێکیان دادەنیشن . حسن الصباح پێان دەلێ : «وامەشهوورە کە کەسێك لەبەردەستی (موفق الدین) دەربچێ زۆر بەختیار ئەبێ» ئەوانیش ئەلێن «بەلێ» وەئەلێ «ئێمەئەگەر دەرچووین بە پیاوێکی گەورە بۆدووەکانی ترمان چ بکا باشە ؟ «ئەلێن» تۆ بلێ «ئەلێ» با هەر کامێکمان زووتر پێگەیشتو شانێکی بۆ یارمەتی دووەکانی ترمان بکات .. لەسەر ئەمە پەیمان ئەبەستن سالەها بەسەر ئەم پەیمانەدا دەروا (ابو القاسم) ئەبێتە وەزیری (ئالب ئەرسەلان) ی دووەمین پادشاهی دەولەتی سلجوقیە وەلەقەبی (نظام الملك)ی ئەدریتێ بۆ ئەمەی کە پەیمانەکەی بە بیر بێنێتەوە (خەیام) و (حسن الصباح) ئەچنە لایو داوای یارمەتی لێدەکەن . رووئەکاتە (خەیام) وەزیفەیەکی گەورەی لە دەولەت عەرزدەکا ، خەیام لەبەر ئەمەی کە زۆر لاگیری جاهو سەتوەت نەبوو . لە پەناییکا ئیدارە کردنو لەسەر تەدقیقاتی عیلمیەی زۆر لەم وەزیفە پێ خۆشتر هاتبووە بەرچاو وە بەم قالە جوابی وەزیر ئەداتەوە . جا (نظام الملك) سالی (١٢٠٠ مسقال) زێری لە واریداتی نیشاپور بۆ تەخسیس دەکات رەوانی ئەکاتەوە ، ئەم وەزیفەیەی کە بۆ خەیامی دانابوو وقەبولی نەکردبوو ئەیداتە (حسن الصباح) بەلام لە دووا جارا وا دەردەکەوێ کە (حسن الصباح) ئەیەوێ مەرتەبەی وەزارەتی لە (نظام الملك) زەوت بکات لەبەر ئەمە لە بارەگای (ئالب ئەرسەلان) دەرئەکرێ لە دەوای دووسال (نظام الملك) بە خەنجەری فیداییکی (ئیسماعیلی) کە موئەسیسی ئەم مەزهەبە (حسن الصباح) بوو ئەکوژرێ «روضە الصفاج ٤ ص ٦١» .

وە بە گویرەی تەدقیقاتی دکتور کریستەنسن پیاوێکی (ابو الطاهر) ناو موساعەدەی خەیام دەکا کە دەوام لەسەر تەدقیقاتی عیلمیە بکات . بەگویرەی ئەم تەدقیقاتە ئەگەر راست بێ ، ئەبێ لەپاش کوژرانی (نظام الملك) موچانەی خەیام برابێ ئینجا ئەم (ابو الطاهر)ە بۆ خەیام رسکابێ ویارمەتی کردبێ ؛عومەر

خـەیام) لە عیلمی فـەلەکیات زۆر شـارەزا ، فەلەکێکی مـەشهـوور بـووە نە (١٠٧٤م ، ٤٩٢هـ) لەسـەر تەکلیفی (نـظام الملك) کە وەزیـری (جلال الدین ملکشا) لەگەل حەوت (نجوم گەرانی تر) ناردنیە بەغدا لەوێ سرنجی ئەستێران بدا ـ رصد ـ نەتیجەی ئەم سەرنجانە زیجي (ملکشاهیان) تەئلیف کردبـوو . خەیام هەروەکو لە فەلەکیات پێشرەوی زانایانی گرتبووە بەر لە عیلمەکانی تریش بە دووا نەکەوتبوو بەلکو لە (عیلمی ریازیات) (متفوق) زۆر تێدا مەشغوول بووە . تا (وپیەك Woepehe) دەلێ ئیبن خەلدون لەموقەدیمەکەیدا کە ووتویەتی لە ١٦ مەخرەج زیاتر معادەلاتی جەبریە حەلکرد تاگەیشتووتە ٢١ مەخرەج ، هەمووی بە نەزەریات وریگایانی هەندەسی راست ئیسپات کەر) .

مرازی عومەر خەیام بووە «هەروەهاش (غـەزالی) (عومـەر خەیـامی بە ریازیێکی فەلسەفی ناسیووە . لە شوێنی خۆیدا ئیشارەت ئەدرێتە سەر تەدقیقاتی (غەزالی) . شهروزی دەلێ» خەیام دکتورێکی زۆر شارەزا بـووە . تا ئـەمیری سنجار قیچکەی لێ دەرچووبوو زۆری لەبەر ئازار بوو ، بۆ چارەکردنی لە دوای عومەر خەیامیان ناردبوو ، عومەر خەیـام لە جاری یـەکەمـدا دەست لە چاك بوونەوەی ئەمیر ئەشواو ئەم قسەیە بە وەزیری ئەمیر ئەلێ مەلێ قولەرەشێکی ئەمیر ئەمەی گوێ لێ ئەبێ و ئەچێ بۆ ئەمیر ئەگێرێتەوە . لە دوای ئەمە کە خەیام زۆر ئیهتیمام بە تـەداوی ئەمـیر ئەدا ، ئـەمیر قیچکـەکانی چـاك ئەبێتـەوەو هێندێکیش حەز لە چارەی خەیام ناکا بەلام ئەم حەز لێنەکردنەکەی لا بەدیار ناخا عومەر خەیام لای ئەمیری سنجر بەنـاوی (نەدیم)ی ئـەمێنێتەوە بـەلام مەسلەکی عیلمیەی خۆی بزرناکا وپێ لە ئەتواری پارە پەرستی شاعیرانی ئەو وەختە نانێ ، بەگویرەی قسەی (ئەحمەد خەیات) ناوێك کە لە زەمانی خـەیام ژیاوە وەکتێبێکی دەست خەتی لە دووا بەجێ ماوە ئەم کتێبە لە لایەن (دکتور عبدالله جەودەتەوە) تەدقیق کراوە . ئەلێ «خەیام» حەز لێ کر دەی شـاعیرەی مەشهووری نیشابور «مەهەستی» ناوێك بووە ، ئەم کچـە شاعیـرەیە لەگـەل خەیامدا زۆر دلشادانە لە قەسری ئەمیری سنجردا ژیاوە .

«طەبعی دووەم ص ١١٤ ـ ١١٥

(٤٥) لە تەرجومەی (عمر الخیام)ی (احمد حمد الصراف)ی محـامی ص ٨٦ (دلدار) .

# «سەرکێش»

بۆ نەوەی تـازە ، بۆ لاوانی میسـرو رۆژهەلات ، میـژوی ئەو کـاروانە موناضیلەیە کەوا دانراوە ببنە نەوەیکی بەخشندە تابتوانن بۆ پاشەرۆژێکی بەرز بازبدەن «مامۆستا ابراهیم الوردانی» .

وا ئەمەت بۆ ئەنووسم ئاوێنەیێکی کۆنی رەنگ تەلخیشم لەسەر مێزەکە دانراوە ، روخسارێکی تیداخۆی کە هەموو غەم و ئەندۆیە کە (نیضال) وای لێ هەل قەندووە کە بۆ خەباتی مانەوە ببتە رەمزێکی پێویستی کەساسی ئەمە جاری دووایی‌یە کە ئەم ئاوینە ئەم دەم و چـاوە ئەبینی چـونکە لەپـاش ئەوەی کـە لەنووسینی ئەم نامەیە ئەبمەوە زۆر بە دیقەت نامەکە ئەپێچمەوەو ئەیخەمە ناو زەرف لە پاشا پوولێکی پۆستەی لێئەدەم ، زۆر لە سەرەخۆ ئەیبەمە لای یەکەم سندوقی پوستەو بوّتی فرێ ئەدەمە ناوی ... لە دووایی بە هەنگاوێکی بەهێزو هێمن و بە تێن رووئەکەمە سەر پردی (قصر النیل) وە سەری خۆم بۆ هەمـوو (قاهیرە)و قاهیرەییان دائەنوێنم و ڕوو وەرئەگیرمو خۆم تورر.هەل ئەدەمە ناو ئاوی «نیل»

نازانم چۆن دەست بەم حیکایەتە بکەم ؟ بیر لە خۆ کوشتن هەر زادەی ئیمرۆم نیە بەلکو زادەی بیریکەو چەند حەفتەیەك پێش ئەوە وامزانی کە چاکترین رێگا بۆ خۆکوشت ئەمەیە پیشەکی لەسەر بانی ئەپارتمانیکێ قاهیرە بە رووتی رابویرم وسەرما هەموو گەرمای لەشم بمژی وژیانم تێدا نەهێـلێو رەق ببمەوە بیرێکی هیچو بێ مەعنا بوو بەلام لای من زۆر تەبیعیە چونکە خوا هشتو ناخوا هشت بی من لەناو چوار دیوار لەسەر بانێکی ئەپارتماندام لەهۆدەییکم کە مانگێ بە نیو لیرەم بەکرێ گرتووەو لەسەر قاتی شەشەمی بلنترینی ئەپارتماتانی قاهیرە هەلکەوتووە لە نکاوێکا بایێك هات چرا کزەکەی کە لە هۆدەکەم هەلواسرابـوو کوژاندی‌یەوە ، پاشا زانیم کە نەوتی بۆ تێدا نەماوەو منیش قرۆشێکم نەبوو کە بچم نەوتی بکرمو بگەریمەوە جا ئەوها هۆدەکەم بەتاریکی ماوەو تـاریکی ئەم

تارمابیە زیندوەی شاردەوە ، کە هیشتـا هەنـاسە ئـەمژی . وە چیم لەدەست نەمابوو بێجگە بە بریقەی چاوی خۆم نەبێ ، بەربەرەکانی رەشایی ئەم تاریکیە تیرە بکەم جا تەنهایی و تاریکی پێکەوە فرێیان دامە سەر ئەوە کە بیرلە رابردوو بکەمەوە رابوردوییکی نزیك .

چ بیرەوەرییکە .... ؟

بێجگە لە خەباتی بەتێن نەبی لەرێگای مانـەوەی ژیان چیتـر نیە من لە تەحسیلی عیلمدا تا ستفی دووی حقوقم خوێند بەلام فەقیری رایگرتم تا پێم بلێ «کەوابوو فەرق لە بەینی تۆو کورە دەولەمـەندێکـا چیە ؟ هـەر شتێکی من لە تەحسیلمدا فێربووم مێشکم بەچەند مەفهومێکی تازەی سەربەستی و زانستی و کەرامەت کرایەوە . وەلەمەعهەدی حکومی فێربووم کە ئەرز خرەو مەخلوقاتی ئـادەمیزادی لەسـەر ئەژین ئـەوانیش سپین و سـوورن و زەردن و رەشن . لە هەریەك (٢٥) سال جارێك لەگەڵ یەك ئیعلانی جەنگ ئەدەن و هونەرمەندی لە ئالات و ئەدەواتی کوشت و برین ئیجاد کردن ئەنوێنن لە وەختانی شێنەیی بەینی جەنگەکان شتێکیان داهێنـا ناوی ـ بـروسکە ـ کـە هرەبـایە و زۆر سـرنجی شتێکیان دا کە پێی ئەلین (فلك) بیرلەشتی زۆر نهێنی و غامیض ئەکەنەوە ، تا داوی سەرداری و حوکم فەرمایی بۆ خۆیانی تیدابکەن .

بەلێ .... بەلێ گەلێك شتیتر فێربووم ... چاکەو کەرامەت و سەربەستی و باوەری و عەدالەت ئەم هەموو شتانە زەخیرەیکن کە ئەبێ ئادەمیزاد دایان بکات تالەناو گەلێکی پڕ ئاهەنگ و مەسعود بژی ، وەئەمەش فێربووم ، کە ئەبێ ژن بخوازم تا مندالم ببێ و ژمارەی نفوسی وولاتەکەم پێ زیاد بکات و فێربووم کە ئەبێ هەرچەندێکی هەژاربم نابێ دزی بکەم ونابێ درۆ بکەم ونابێ شتێك بکـەم کە موجتەمەعم زەرەری لێبدێنێ .

بەلام چ قازانجم لەمانە کرد ؟

وابەسەقافەتێکی پەشۆکاوی بە سرنجی خۆم ئاو دراوەوە هاتمە دەرەوە . گەرام کە لە شوێنێك بژیم کە چاکەو سەربەستی تێدابێ قەدری پیاوەتی بگرن و دان بە رەوشتی چاکەدا بهێنی ، بەلام بەبێ ئەوەی کە زانست چ کەلکێکم بگرێ هەروەکو کتێبەکان ئەیانەوێ بەو چەشنە ژیام . لەو رۆژەی کە بەجێ هێشت خۆم گەلێك ئیش وکارو دووای یەکەی ئەم ئیشەیە کە ئێستا ئەیکەم ئـەویش کابتی محامێکی موفلیسم کە لە پایەی دەهەمە . ئەومحامیە کەسی نایەتە لا ئیلا ئەگەر

موعجیزەیێك روونەدات . خاوەن ئیشی بێمێشك لە دەرگا ئەداوە منیش معاشەکەم کەی محامی پارەی زیاد بوو ئینجالەوی وەرئەگرم کە ئەمەش بەدەگمەن وا ئەقەومێ ئەوەل جار وام دانا کە ئەبێ قانیع بم هەروەکو فێربووم . بەلام ئەو قەناعەتە زۆر شتی پێ ئەویست ، ئەویش ئەبایە هەندێك جار بە برسی یەتی رابوێرم هەندێك جاریش کری هۆدەکەم تەئخیرکەم وبەپێڵاوی دڕاو کراسێکی شرو زگێکی بە تاڵ هەموو جارێك بسوڕێمەوە هەروەکو هەموو لاوێك ئەوەشم بەسەردا تێپەریوە کە دڵم وەك فەنەر بۆ دڵسۆزی و خۆشەویستی ئافرەت ئەسووتا . دڵم بۆ ئەو مەخلوقە ئەسووتا کە بەدیار کەوتووە کە لە لەنیوەی دانیشتوی وولاتەکەم زیاترن بەم دووابی یە کەوتە بەردەستم . زروف وای کرد کە لە مەکتەبی محامی کچێکی چاکی هێمنی ناو (لەیلا) بناسم و هەندێکی لەگەڵ دانیشتم هەستم بە دڵسۆزی هاوملێکی نازکی بەگەرمایی لاوێتی هەردوو لا لەم تەمەنە ئاودراوی خاوێن کرد . من باسی . خۆم بۆکردو ئەویش باسی خۆی بۆ کردم ... زۆر زوو خۆشم ویست وهەستیشم بە واقیع کردبوو . ئەویش خۆشەویستی منی بە چاوێکی خاوێنی بە فرمێسك تێ زایراوەوە قەبول کرد . کە هەر نیگایەی هەموو مەعنایەکی دۆستایەتی و دڵسۆزی و دل روونی تێدا بوو ، بە زۆر بەیەك گەیشتنمان (لەیلای) دل ساف هەستی بەمەکرد کە ئەبێ لەگەلم بێت و بچین و بۆ شوێنێکی دوور تا مەسعودم بکات .

ئەڵێم ئەو دەمانەی کە لەیلام پێناسی ئیستاش باوەریم بەمە هەیە کە چەشنە سەعادەتێکی هیمنی پێ بەخشیم کە هەردەم لەناو گێژەلوکەی هەژاریمدا دڵی ئەدامەوە و لەوەختی خۆی هەستم بەمە کرد کە من خاوەنی شتێکی زۆر بەنرخم کە ئەویش دڵێکی زێرینە کە هەموو مالی دنیا ئەهێنێ ، لەو دەمانە هەرچەندێکی رووم لەهەر لایێك دەکرد تووشی کۆسپەی فەشەلی ئەبووم بەلام لە خەونێکی زۆرخۆش ئەژیام گەلێك جار لەبەرخوا ئەپارانیەوە کە لە شوێنێکدا جێگیربین ژیانێکی خێزانی زۆر مەسعود دامەزرێنین . وە وامان ئەزانی کەخوا ئەمەی پێ ئەکرێت ، کە خانوێکی بچوك و معاشێکم بداتێ تا بچم داخوازی لەیلا لە باوانی بکەم و بیخوازم مندالمان ببێ وە بکەوینە خۆشی ، لە ناوەندی ئەم خەونە مندالانە بەخەبەر دەهاتین کە لەیلا دایکی هەیەو باوکی هەیەو بێشك بۆی لە مەردێك دەگەرێن کە خۆشی لەگەڵ بدینی و بەرێ و جێبێت . بەلام من کورە

کرمانجێکمو کەسم نیە لێم بپرسی وەیا خـۆم تێبگەیەنی جـا من لە کوێو ئـەو لەکوێ ، غەمێکی تربالی بەسەر هەلکێشام خۆم لە پێش چاو ئەکەوت وە رقم لە هەموو (موجتەمە ع) ئەبۆوە وە ئێستا کە من لە بەرزترینی شوێنانی قاهیرە ئەژیم روو بە فرمێسکی چاوان و لەشم بە ئاوی باران ئەشۆم ... من لەو خەیالە و دەنگی هات و هاوارو قیرە قیرێکم کـەوتە بـەرگوێ راوی یـەکێکیان ئـەنا ، هێنـدەی پێنەچوو گوێم لە یەکێك بوو کە زۆر بە پاڕانەوە داوای ئەمەی لێئـەکردم کـە دەرگای لێ بکەمەوە ، لەناو جێگایەکەم هەلستام لە قلیشەی دەرگـایەکـە هەر چەندێکی تاریکیش بوو تارمایی پیاوێکم دیت کە کـراسێکی لەبەر بـوو زۆر بە هەناسە برکێو ترس و لەرزەوە ئەیووت ڕاوم ئەنێن ، من مەزلوومم ـ بڕواکە من مەزلووهم گوێم لە دەرگەوانەکان بوو کە لەدەوری دزەکە ئەگەڕان لێی ئەگەڕان و هاواریان ئەکرد ... کەهاتووتە سەربان ... لێرەو لەوێ ئەگەران تا یەکێکیان کە زۆر ماندوو بوو ووتی بێشك دزەکە بازی داوەتە سەربـانی ئاپـارتمانـەکەی تەکمانەوە بالێی نەگەڕێـین بەسـە ، ئیتر بـەم حالە خـۆم لە قوژبنێکی هـۆدە تاریکەکەم ماتکردبوو .. وەئەم پارچەو پوچە قانونی کە لە حقوق دەرخواردیان دابووم لە گوێما ئەیچرپاند کە من دزێکی لە قانون هەلاتووم داکـردووە ... وە پیویستە لەسەرم تەسلیمی دەستی عەدالەت و قانـونی بکەمـەوە ... من لەم بیرکردنەوەیە بووم هەستم بە دەستێکی لەرزۆك هەناسەبێکی سوار کرد کە شانم ئەگری دەموچاوم ئەسووتێنی ئەپاڕایەوە کە لە هۆدەکەم دایکەم تا ئەم هەلایە ئـەبڕێتـەوە جوابم پێ نـەدرایەوە ... چـونکە مێشکم بـە چەنـد بیرەوەرێکی پەشبۆکاوەوە لە سوڕان و تەوژم دابوو . لە عنەتم لە چراکەی کوژاوە کرد . کە بسووتابایە قیافەتی کابرام پێ ئەدیت ئەوسا ئەمزانی راست ئەکات یا درۆ ئەکات بەلام ئەم کابرایە دلسۆزیمی بە تەوژم پێخست و حالەتی کەساسی و لێ قەوماوی هەموو عاتیفەیێکی لێ هەژاندم ، خێرا پارچـەو پووچـەکانی قـانونم قـوت داو بەسەهلی هەزمم کرد مام کە لە کابرا بپرسم کە کێیە ؟ وەخەلقی کوێندەرە ؟ وە لە کوێندەر بوو ؟ وبۆچی ڕاوی ئەنێن ؟ ووتی «پێم بـڕوا ناکـەن ... بە شێتم تێئەگەن .... ئیمشەو وایان زانی کەمن لە دزی ئەگەڕێم ... وەللا سوێند ئەخۆم کە من مەزلومم ـ مەزلومی ؟

بەلێ مەزلومم ... من پیاوێکی ئەفتادەم ... کورێکم هەیە کە لەقاتێکی ئەم ئەپارتمانە دائەنیشی .

خۆم پێ رانەگیرا ، کە بەم درۆ ئاشکرایەی ئەم کابرایە پێکەنیمو قەشمەریم پێکرد ، لەدلی خۆمدا ووتم ئەبێ ئەم سوالکەرە ، کە هێندە نەماوە دروشمی جلکی شریو ناکەسی لە ووتارەکانیو هەناسەی لەم تاریکیە بێتە بەرچاوم ئەبێ ئەمە کێبێ کە پارچە جەرگی لەم ئەپارتمانە دانیشتبێ ؟ ئەمە شوێنی دەولەمەندانە ... شوێنی ئەم دەولەمەندانەیە کە سەودا لە سەر کرێی هۆدە ناکەن لایان فەرقی بەینی سەد وە حەفتا شتێکی هێندەکەمە کە ئەم سەر ئیشەو چەندو چوونە ناهێنێ ...

کابراش ووتاری خۆی نەبڕیبوۆوە مابلێ :

«من لام ساغ بووەتەوە کە ئەولێرە دائەنیشێ ، وا هەفتەییکە هەموو رۆژێك دێم لێی ئەپرسم دەرگاوانەکان دەرم ئەکەن ، تا ئیمشەو بڕیارم دا کە لە تاریکیدا خۆم بشارمەوە و بێمە ژوورەوە وامکرد دەرگە بە دەرگە لێمداولە دانیشتوانیم ئەپرسی بەلکی ئەیدۆزمەوە تا گەیشتمە دەرگاییێك لێمدا ، ئافرەتێك دەرگای کردەوە ... نەیهێشت بدوێم ... لە هاواری دا .... منیش رام کرد ، چەند زەلامێك کە لە دەنگی ژنە بە ئاگا هاتبوون سەریان لە دونام و راویان نام ....

لێم پرسی «ئەم کورەی تۆ ئەبێ کێ بێ ؟ ووتی «کورم ... تۆ نایناسی بەلام هەر ئەبێ پیاوێکی زۆر بەناوبانگی لێ هاتبێتەوە لەمەکتەبەکانم پێ خوێند ... بەلێ لە مەکتەبەکانی حکومەت و بووە خاوەن شەهادان من فەلاحێکی فەقیرم قەرارم دا کە کورەکەم پێبگەێنم ناردومە قاهیرەو مەسرەفم لێکرد تاوەك کورە پاشایەکانی لێ دەرچێ . من ودایکی خوێنی خۆمان خواردەوە تا مەسرەفمان بۆ پەیداکرد چونکە بە خۆرایی قبول نەدەکرا ، جا کورەکەم زۆر بەسەرکەوتوویی ئەیخوێندو ناجیح دەبوو زۆریشم قەشمەری بەو باوکانە دەکرد کە کوری خۆیان وەك من پێنەگەیاند ، بەلام زۆر کەودەن بوون قەشمەریان پێنەکردم ، من لە قەشمەری وان توورە نە ئەبووم بەلکو بەزەیم پێیان ئەهاتەوەو ئەوانم گشتی بۆ پاشەرۆژ گرتبوو ، تا کورەکەم دەرئەچێو ئەبێتە پیاوێکی گەورە کەلکی خدمەتی منو گوندەگەی ئەبێ ئینجا بە چاویان دائەدەمەوە .

بەلام رۆژێك لە مەکتەبەکەیەوە کاغەزێکم بۆ هات کە ئەلێ ئەگەر مەساریف بۆ مەکتەب نەنێرم کورەکەم لە مەکتەب دەرئەکەن ، سەرسام مام ، ئەوێ رۆژێ هەر هیچم شك نەئەبرد گاجوتەکەم ومانگایەکەم وبزنەکەم فرۆشت هێندە نەبوو کە مەکتەب داوا ئەکات ، شەوێك هەتا سەر نەنووستم هەر لەمە ئەفکریم کە چۆن

ئەمەی حکومەت داوای ئەکات پەیدای بکەمو بینێرم تا لە دوا جارا بریارمدا وە ووتم پێویستە کورەکەم هەر چۆنێك بی دەبی هەر بخوێنێو ئەو پارەیەی بۆ پەیدا بکەم ... هەتا ئەگەر جەریمەیکیشم کردبێ ئەبێ بۆی بنێرم .... ئیتر بۆ شەوی دووایی چوومە سەر مالی «سەررافی شار»و پارەیەکم لێ دزی بەلێ پارەیەکم لێ دزی کە بۆ حکومەت بنێرم نەك کورەکەم لە مەکتەب دەرکا وە دلی خۆشم بەمە ئەدایەوە کە من لە پاشەرۆژ وە ئەو وەختەی کە کورەکەم لە مەکتەب بە پیاوێکی گەورەو دەولەمەنـد دەرئەچێ من ئـەو پارەیـە ئەدەمـەوە «سەرراف» بـەلام ئیشەکەم لێ ئاشکرابوو ، ئەویش کە چووم پارەکە بە حەوالە بە ناوی کورەکەم بنێرم مەئموورى پۆستە گرتمی ولێی ئاشکرا کردم سی سالیان حوکمدام ... چەند مانگێکم لە بەندیخانە رابوارد ، نەم ئەتوانی کەمن بێی کورەکەمو ژنەکەم کە رووتو قووتو بێ نانو خواردن بەجێم هێشتوە ئەم سی سالە لە بەنـدیخانـە هەلبکەم ، هەولی هەلاتنمدا بەلام گرتمیانەوەو حوکمیان زیادکرد ... دیسان چەند جارێك هەولم دایەوە هەموو جارێك ئەیانگرتمەوە ، تا لەحەفتەی رابوردوو حەفت سالەم تەواوکرد ... بەلێ لە بەندیخانە هاتمە دەرەوە کە بزانم ژنەکەم لە پێش چەند سالان مردووە ، دلم نەی هێنا کە بچمەوە گوندەکەی خۆم ـ ویستم کورەکەم بدۆزمەوە پێیان ووتم کە لە مـەکتەب دەرچـووەو بوویتـە محامێکی بەناوبانگو لەم ئەپارتمانە دائەنیشێ .

ئایا پێم باورناکەی ؟ ئەمە راستیەکەیەتی لێم ببوورە ... من ناتوانم ئێستا لە پاش ئەم هەموو حـەیا چـوونی حەپس کـردنە کـە بێی کورەکـەم بچمەوە گوندەکەم ، ئەمەوێ کە کورەکەم بدۆزمەوە ، ئینجا بچمەوە تا ئەو کەسانەی قەشمەریم پێئەکەن پێیان بلێم ئەمەتا کورەکەم کە پیاوێکی گەورەو شارستانی وبەدەستە سەرتانی بۆ شۆرکەن ئەی فەلاحە نەزانەکان ... !!

ئەلێم گویم لەم پیاوە راگرتبوو و ئەویش بە هەناسە برکی ئەم باسەی بۆ ئەگێرامەوە . لە باسەکەی بۆوە من وسکت ورەق وەستام ... هەستم بەمە کرد کە من کورژ ئەبمەوە و ئەتاویمەو و بە ئەرزا ئەچمە خوارەوە .. ئاگـام لێبوو کـە شتێکی زۆر بەهیز من فرێ ئەداتە ناو کیژەلوکەی گێـژیو سەرسـوراندن ... کابراکەش هێشتا بروای نەکردبوو کـە من بروایم بـە ووتارەکـانی هاتـووە ، لەسەریەك لێی ئەپرسیمو ئەی ووت «بروام پێ ناکەی ؟ بروام پێ ناکەی ؟

بروای پیٚبکەم ... ؟ ! جوابم نەدایەوە .. مام کەلەناو بزورگ کە لەبەردا مام ، لە پارچە مومێك بگەڕێم وبیان پشکنمەوە تا پیٚی بکەم ، دۆزیمەوە ، شخاتەبیکم لیداو مومەکەم پیٚکرد ، تاریکی پەرژا ورووی ئەم ئەفتا دەیەم لا ئاشکرابوو .. رووبە رووبە رامبەر یەك وەستاین زۆر بەتین سەیرم ئەکرد ، بەلاّم تێنی چی هەر ئێستا هیچی نامینی ، ئیتر هەر سەیرم ئەکردو زیاتر دائەوەشام .. سەیری ئەم کەساسی یەم ئەکرد کە بەندی حەفت سالان لەسەر رووی ئەم ئەفتادەیە هەلی قەندووە و بیست سالان برسیەتی و نەزانین و نەخۆشی بەجیٚ هیٚشتووە . بەم هەموو ناشیرینیەی کەکابرا بە خەباتی مانەوە لە ژیانی ئادەمیزادی و تالاو و ژالاوەوە پیٚکەوەی ناوە بەم هەموو لەرو لاوازیەی کە ئیسقانی لەشی یەك یەك دەرپەریوەو دەستی زالم هیٚنری تیٚدا نەهیشتووە ... بەلیٚ بەم هەموو دروشمەییەوە کابرا ووتی پیٚم بروا ناکەی ... ؟

- من ... من باوەریت پیٚ ئەکەم ... باوەریم بە هەموو ووشەکانی کە لەزارت هاتە دەرەوە

- توخوا .... توخوا

- بەلیٚ - چونکە من کورەکەتم ... باوە گیان ... ! !

خۆشەویستەکەم ... چ چەشنە دووایەکت لەم چیرۆکەیە پیشکەش بکەم ؟ ئەزانم ، لەبەر ناخۆشی کۆکەو کارەساتی ئەم چیرۆکەیە سەرت ئەسووریٚ وا دیتە بەرچاوم کە چاوەکانت کراوەتەوە و لیٚوت ووشك بووەو دەستت و لەشت لەم باسە ئەلەرزیٚت . بەلام بەراستی وابوو وە وا قەوما کە دیتت .. پیٚویستە کە خۆت رابگری تا سورەتی تەبیعیەکەی دوایەکەت تەقدیم بکەم .

باوکم واقی ورما .. دەنکی لیٚوە نەهات ... بەلیٚ ووشەیکی نەووت چونکە زوبانی شکا .. و نەیتوانی چ بجولیتەوە تا دووکەس جلکی سپیان ، لەبەرکرد قۆل پیچیان کردو بردیانە بیمارخانە ... بیمارخانەی شیٚتان کە لە دووری (عەباسیە) هەلکەوتووەو بەباغێکی جوان دەورە دراوە چەشنە نەوییکی مەیموونیان لەناو قەفەس زل زل بەند کردووە پیٚیان دەلیٚن ... ئادەمیزاد ... بەختیارەکانیش بە دلسۆزیەوە وە لە رووی چاکەوە ناویان لیناوە «بیمارخانەی شیٚتان ئیٚستا وا تیٚدەگەم لە هەموو کەس هەلگەراومەوە تا بەرادەییٚك ناتوانم ئاشکرانە کردنیم پیٚ رابگیری ... باوەریم وایە لەم هەلگەرانەوەم گەر رۆژیٚکی تر بژیم کۆمەلیٚك ئینسان ئەکوژم ... ئەکوژم تا ئاگری ئەم تۆلەیە بکوژینمەوە کە

خەلق بە شتێك هەلنەخەلەتێنن كە ناوی عەدالەت و پیاوەتی و حقوق و مساواتە .

من بێ دەستەلاتم .. زۆر بێ دەستەلاتم وا لە خۆرا ئەبینم كە ناتوانم هەتا مێشێك بكوژم ... لەبەر ئەوە وا گەیشتمە ئەم نەتیجە تەبیعیە كە من ئەبێ یەكێك بكوژم كە خۆی تەسلیم ئەكات .. ئەو كەسەش هەر خۆمم ... !

بە دوعا ... زۆرســـەلامم لەسێ سوارە وولاتــە شیرینــەكەم بكــە ئەوانیش نەزانین ، هەژاری ، نەخۆشی ، چاو چنۆكیە ! ..

ملاحظە / وا دووبارە ئەم زەرفەم هەلیچری و نامەكەم هینایە دەرەوە تاشتیكت بۆ بگیرمەوە .

لە شەقامی فوئادی یەكەم ئەرۆیشتم تا ئەم نامەیەت بۆ بهاویمە پۆستە . ئەرۆیشتم و هەستم بەمە ئەكرد كە تەمو مژێكی تاریك بەری چاوی گرتووم ، و هێندەی نەمابوو كە لە دەست هەراهەراو دەنگە دەنگی خەلقی شێت ببم ...خۆم لێ ئەدان گویم لە قسە بێ سەروپایەكانیان زۆر بەبێ باكی رائەگرت . چ پەكم لەمە نەكەوتبوو كە ئایـا پا لە ژنێـك یا پیـاوێك ئـەنێمو داوای لێ بووردنیشم لێ نەدەكردن چونكە بۆ مردن ئەچووم .. بۆ ئەوە ئەچووم كە خومیان لە كۆل بكەمەوە لە ناكاوێكا خۆم لە كچێك‌دا .. كچێكی لە تەمەن چواردە سالان زیاترنا .. زۆر جوان و دلارام و بە ئاو بوو .. هــەموو جــوانی مندالی و دلارامی لاویــەتی تێدا كۆببوۆوە ... ئەشی عادیش بێ بەلام ناتوانم بۆتی وەسف بكەم .. شتێكی كرد لەو دەمە وای لێكردم كە بەیەك لە فریشتەكانی ئاسمانی‌دا بنێم كە زۆر شتم لەسەر بیستوون ما خولیای فرشتەم ئەكرد .. خۆم لیدا هیچیش بە تەمــا نەبــووم كە داوای لێ بووردنی لێبكەم ... دیم كە راوەستا ساتێك كرژیەوە بە خەندەبێكی دل روونی جوانێكی بێ گەرد ... خەندەبێكی دلسۆزان و هێندە نازك پڕ ئەدەب بوو كـە زوبانی تێـدا ئەتـوایەوە .. ئـەوخەنـدەیە لە نیـو دەقیقە زیـاتـر دەوامی نەدەكرد ... پاشان لێم تێپەری ... رۆیشت هەتاوون بوو .. هەستم بەمە كرد لەجێی خۆمدا ووشك بووم و هەموو دەمارێكی كە مابووم تێـدا كوشتم ، هــەر چاوەكانم بەشوێنی كەوتبوون ئەیەویست ئەم جارەش بیدۆزتەوە نازانم چەندوا مام ؟ بەلام نیو سعات تێپەری و من لەم سەرسامیە عەجیبە مامەوە ، هەستم بەمە كرد كە خەندەی ئەم كیژۆلە ئازایە كاری ئاوێكی ساردی كرد كە لەگەروی تینوێك و لەلەشیدا ئەگەڕێ وە وام هاتە خەیال كە دەمارەكانم دامریەوە و ئەم ئاگری تۆلەیەی كە من بۆ خۆ كوشتن رائەرفاند كوژایەوە لەجیاتی ئەمە هەستی

به جوانی زەمین شیرینی ژیان کە لە خەندەی ئەم کیژۆلە جوانە دابوو جێگیربوو ئەشێ تۆ بەشێتم دابنێی ... بەلام بۆت دووبارە ئەکەمەوە کە ئەم خەندەیە کونێکی بۆلە دنیا کردم ، کونێکی زۆر سەیر وای لێ‌کردم کە لەم کونە سەیری ئەم دنیایە جوانە بکەم ئەم دنیایەی کە خەلق لیێ بەهەلە دەچن بۆ ماندو بوون رائەکەن ... ئەم تەبیعەتە هەموو سالێك پێکەنین‌و خرۆشی‌و ئاهەنگی تیدا نوێ ئەبێتەوە بەلام پال بەو ، کەودەنانەوە دەنێ کە دلیان بەرداوەو بەزیون بێ ئومێدن تێدا ، ئەوانەی دوودڵن‌و فاشیلن .

لێم ببوورە برا گیان

خۆم ناکوژم ... دیسان دەژیم هەتا دیسان خەبات نوێ بکەمەوە لەناوپاش خەباتێك دەکەم خەندەی سەرکەوتن لە لێوم ناکەوێتە خوارەو . ئەو خەندەیەی کەلەکچێکی دلارامی چواردە سالانم دزیوە[٤٦] .

---

(٤٦) د٦لدار ئەم چیرۆکەی لە عەرەبی یەوە وەرگیراوەتە سەر کوردی دانەری چیرۆکەکەش ماموستا (ابراهیم الوردانی)یە .

## کچم نەسرین[٤٨]

### لە بەغداوە ـ یونس ڕەؤوف

تالات بووم ئەمویست کە ئەم چەند گفتارەی کەوا بۆت دەنووسم ڕوو بە ڕوو پێت بڵێم .. چونکە هەر لە مەیانی من و تۆدا ئەمایەوە .. ئێستا وا لێت دوور کەوتمەوە ئەم نامەیە پێشکێش تۆو هەموو کچانی کوردی وولاشت و هاوتەمەنت دەکەم .

کچم .. تۆ منداڵ بوویت ، کۆرپەبێکی شیرە خۆرەی زۆر ئێسك سـووك چاوە کاڵە بچکۆڵەکانت سێبوریو فینکایەتیکی ئەوتۆی ئەبەخشیە دلانـەوە کە هەموو لاییکمان وەکو یەك بەخۆشەویستیەوە ئەهەژاین ، لەگەڵ لێوە باریکـە سـوورەکانت بـە زەردەخەنـەی بەرییێ منـداڵییـەوە ئـەگـرژییـەوە ئیمـەت ئەگرژاندەوە ، بە زریق وباق و گاڵەو گپتـەوە لە قاقـای پێکەنینی سـەرگەرمی دلسۆزیمان ئەدا . هەروهاش بە ماتیت مات و بە گریانت دڵ تەنگ و بە نەخۆشیت تێك دەچووین بە تایبەتی (دایکت) بە خۆشیتەوە پێشرەوی هەموومان بوو . وەلە نەخۆشیشدا ، یەکەم چاو بوو کە دلۆپەی مروارینی فرمێسکی زۆر گەرمی بۆ ئەباراندی چۆن خۆت دێتە بەرچاو ؟ ئایا چەند کەسێك کە سەرچاوەی خۆشیان منداڵێك بی چۆنی تەماشا ئەکەن ؟ ئەم پرسیارە ئەبێ لە خۆتی بکەی ... تـۆ منـداڵ بـوویت .. کچم ... وەکـو پـەروانـەی دایـك و بـاوکـت لە دەورت هەڵئەسـووران ... لە هەمـوو شتێك تـۆیان بـەسەر سنگی خـۆیانـەوە ئەنـا لەسەرمادا جێگەی گەرمیان بۆ تەئمین ئەکردیو خۆیان ئەدایە بەر سەرما ، لە گەرمادا جێگەی فێنکیان بۆ تۆ ڕەچاو ئەکرد خۆیان گەرمایان هەڵ ئەبژارد . لە نەخۆشیدا شەو نخوونی تا بەیانی لە پشت سەرینەکەتەوە دائەنیشتن و ئێشکیان لێ ئەکیشای . هەرچەند جارێك نکەت بهاتبایە لەبەر ئازارێکی دەرەوە ئەوان لە

ژوورەوە جەرگیان لە زریکەی ئەدا ، چیت بۆ بلێم ... ؟ بۆ پاریزتنی تۆ هەرچی عەزابێکی کە تاڵ بووایە بەبێ پوونگانەوە هەلیان ئەکوتایە سەر . تاتۆیان گەورە کردو تۆیان گەیاندە ئەم رادەیە ، ئێستا گەورە بوویت ، ئەم نامەیە بگرە دەست ، بچۆرە پێش ئاوێنە گەورەکەی مالەوە سەیری خۆت بکە . خۆت ئەبینی ؟ کە کچێکی بەژن باریکی تازە هەلچووی ؟ هەموو ئازای لەشت بەرەو گورێنێکی ئاشکار دەچی بۆ پاکەیشتن بۆ جوانی کچایەتی بۆ ژیان ئەرۆیت کچم .. لەدوای ئەم عومرەت و لەو تەمەنە و بەو دوواوە ئەبێ کێ بتپارێزی ؟ ئایا هەروەکو مندالیت پاریزگاری خۆت ئەخەیتە ملی دایك و باوکتەوەو ئەگەر واشت باوەر کردبوو راستە ئەوان ئەتوانن ئەم پارێزگاریە بکەن ؟ جاران پاریزگاریت شتێك بوو کە توانای هەموو دایك و باوکێك داهەبوو ، چونکە مندالێکی بچوك بوویت بەلام ئێستا پاریزگاریت شتێکی ترە ، بێجگە لە خۆت لە توانای کەسدا نی یە . مرازم لەم پاریزیە ، لەرسەرماو گەرماو نەخۆشی و بیماری زەرەمەندو پاریزکردن نی یە . ئەم چەشنە پاریزیە بە غەریزە هەموو لایێکمان بەرامبەری ئامادە وەستاوین بەلام مرازم پارێستنی رووحیتە مێشك خاوێن کردنەوە ـ خوورەوشت بالاکردن و خۆ لە نەخۆشی گەلایەتی پاراستنە . مرازم لەم پارێستنە ئەمەیە کە هەموو تازە هەلچوونێکی وەکو تۆ دووچاری ئەبێ کەم کەس وایە خۆی پێ لەبەر دەستی رزگار دەکرێ ... تۆ وا گەورە بوویت ... لە مەکتەبیت .. ئەتوانیت کە نووسینان بخوینی یەوە زینهار بەهەموو شتێکی کە لە کتێبدا نووسراوە لە بابەت خۆشەویستی و حەزلێکردە پیێ باوەر نەکەی وا من بۆ ئەمەی کە خۆشەویستیت بۆ بەیان بکەم پەلاماری چەند باسێك دەدەم کە لەباسی ئێمە بەدەرەو پیویستیشە ... خۆشەویستی راستەهەیە ، حەزلێکردەیش هەیە .. بەلام حەزلێکردەبێکی کە تووشی بێ باکی و روو هەلمالین و حەیا تکاندن درۆیە . حەز لێکردەیی (مەلەکەییکی) چاکەیە کە لە مندالییەوە لەو شەخسەدا مەوجوودە ، بەشتێك ئەم مەلەکەیە ئەتەنی خاوەنەکە ئەباتە ئەو جێ بلندی و کەمالەوە شورەت و شانێکی زۆر گەورەی بۆ پێکەوە ئەنێ .

---

(٤٨) ئەم نامەیە هەرچەندە بەناو بۆ (نەسرینی) برازای ناردوە بەلام لە راستیا ئامۆژگاریەکانی دلدار ئاراستەیە بۆ هەموو کیژێکی تازە پێگەیشتووی کورد .

# «لامارتین»

هاوڕێ خۆشەویستم (نورالدین بها الدین) لە گوڤاری گەلاویژدا لە ژمارە ٩و١٢ ساڵی ١٩٤١ قەسیدەکەی گومی لامارتینی بە کوردی تەرجومەو بلاوی کردەوە ، خوا هەڵناگری زۆری پێوە ماندو بووە ماندوەکەشی بە خەسار نەچوو بوو چونکە حەقیقەتی ئەدەبی ئەم قەسیدە بەناوبانگەی ئەم شاعیرە بزورگەی فەرنسی بە دیارخست . هەر تەئسیرو نەشەی ئەمەیە کە منیش مێژووی ژیانی لامارتینتان و ئەدەبیاتیان پێشکەش ئەکەم .

لامارتین کێیە ؟

ناوی بە تەواوی ـ الفونس لامارتین ـ ٥ لەساڵی ١٧٩٠ لە «ماکـون» لە دایكو باوکێکی زادەگان لە دایك بووە . ژیانی مندالی لە ژێر چاوەدێری دایکیا لە «حیلی»دا رابواردووە . جاری یەکـەم دایکی بۆ ئـەمەی کـە فێری نـووسینو خویندنی بکات تەسلیمی قەشەیکی کرد کە ناوی «مونت» بوو ، ئەم قەشەیە زۆر لەئەدەب شارەزاو خەیال پەروەر وورد بوو لامارتینیش بە جەوهەرە زاخدا . لە پاش ئەمەی کە هەلاشو باهوش بوو ناردرایە شاری «لیون» کە لەوێ لە مەکتەب بخوێنێ و هەر لەوێندەریش داخیلی مەعهەدێکی یەسوعیەکان بوو سەقـافەتی ئیکمال و لەفەلسەفە شەهادەی وەرگرت لەساڵی ١٨٠٨م گەرایەوە لای کەسو کاری ئەوساکە «ناپلیون بونوپارت» حوکمی بەسەر فەرەنسەدا ئەکرد ، لامارتین زۆر قینی لەئیمپراتورو حوکمەکەی دکتاتـوری ئەبـووە لەبەر ئـەوە لە ماڵەوە دانیشتنو موتالاکردنی بەسەر سیاسەتبازی و وەزیفەی حکومـەتدا تـەرجیح کرد . مایە سەرئەمە کە زۆر بە ووردی کتیبەکانی «روسو ، تاس ، بـەترارك ، شکسپیر ، ملتون ، شاتۆبەریان ، ئاسیان ، بخوێنتەوە لەوساکەدا زۆرچاك فێری

زوبانی ئینگلیزیو ئیتالیابی بـوو ـ تاسبیت ـ ی خـویندو تیی گـەیشت . ئەم فورسەتە بۆ لامارتین زۆر بە قیمەتو جێگای مەعهەدیکی ئەدەبی زۆر بەرزی بۆ گرتەوە تێرلەم سەرچاوانەی خواردەوە .

لامارتینو دلداری :

شتێکی زۆر بەدیهیە کە عاتیفەو خەیالێکی نازكو حەساس وەکو عاتیفەو خەیالی «لامارتین» ئەبێ لە خۆشەویستیو دلداریدا زۆر بە تەوژم بێ . لە گەنجیدا جاری یەکەم بورکانی دڵداری بەسەر کچێکی زۆر دلارامی ـ مبلی ـ یەوە تەقیوە بەلام چ تەقینێك ؟ چەندبەتین ؟ لامارتینی بەتەواوی گۆڕیو سیحەتو عەقلو هۆشی لێ تێك دابوو . رۆژ بە رۆژ زەردو ئەبینیا ، بۆئەوەی کە سەبووری بێت ئەم کیژەی لە بیربچێتەوە ناردیانە ئیتالیا . بەڕاستی نازانم کە چەنـدی لە ئیتالیـا رابواردووە . بەلام وا دەرئـەکەوێ کـە ئەم سـەفەرەی زۆر بـۆ باش بـووبێ سیحەتو عەقلی هاتبیتەوە سەرەخۆی بەلام ئەم خۆشویستنەی کە لە دلیا بوو برابۆوە ، وەیا ئەم ئاگرەی کە گەنجایەتی لە سینەیدا هەلی کردبوو کوژابۆوە ! وابزانم نەکوژابۆوە بەلام تەوجیهی گۆڕابوو . چونکە ئەو وەختەی کە لە ئیتالیا گەڕایەوەو داخیـلی سلکی عەسکـەری بوو وە لە دواجـارا خۆی فـرێدایـە ناو کەفەلوکەو گیژاوی سیاسەت بازی وازی لە شیعرو بە دیارخستنی دلداری خۆی هەرنەهێنا بوو ، ئەم چۆرە فرەی کە ئەم لە بادەی دڵداریـدا فری کـردبوو وا تەئسیری تێکردبوو کە هەموو دەم بەنەشئەو سەرخۆشی ئەم دلداریەوە بژی لە سالی ١٨١٦ لامارتین تووشی نەخۆشی جەرگ هات ، دکتۆرەکان وایان بەباش زانی کە بچێتە دەرماناوەی (اکس) وەخۆی بەو ئاوە بشوا ، لەوێ چاوی بە ژنێکی رەنگ زەردی بەژنو بالا جوان کەوت جێبەجێ خۆشەویستی ئەم ئافـرەتەی کەوتە دلو خۆی لێ نزیك کردەوە . ئەم ژنەش «چولیاشـارل»ی ژنی «مسیوشارلی» گەورەترین زانایانی ئەنجومەنی زانستی فرەنسە بوو . «چولیا» وەنـەبێ هەر بەڕەنگی زەردیو بنیان و بێتاقەتی خۆیەوە عەتفو دلسۆزی لامارتینی بۆخۆی ئیحراز کردبێ و بەس بەلکو بە حەز لە تەنهایی کردنو فیتنەجوییو چاوەکانیو سەقافەتی بەرزو سحری گفتارەکانیەوە هەرچەند کۆنەبرینی دلداری لامارتین کە هەیبوو لیی کولاندەوە سەرلەنوێ بادەیێکی پڕی دلداری دایێ لامارتـین بە دەرجەیێك «چولیا»ی خۆشەویست کە ئەتوانم بلێم خۆشەویستی جاری یەکەم بە

نیسبەت تەوژمو بەتینی خۆشەویستی «چولیا» شتێکی ناو نەبراو بووە . لەناو هەوایکی بۆن خۆش ئەم دلداریە تازەیەدا لەسەر گومی (بورجی) کە پیرۆزترینی شوینانی دلداریە سی حەفتە مەی دلداری زۆر خاوێن و پاکیان نوشی جاری دووەم لەسالی ١٨١٧ لەپاریس لەمالی مێردیدا «چولیا» و لاماریتن گەیشتنەوە یەکتر . لەدوای لێك جودابوونەوەیێکی کەم چوار مانگان لەناو باغچەی دلگیرانی پاریس و سەیرانگاهە دلرفێنەکانی زۆر بە خۆشیو شادی دلداری‌یەوە رایانبوارد جاری دووەم لەسەر ئەمەی کە لە «ساڤووای» بگەنەوە یەکتر بەلێنیان بە یەکتردا لامارتین بۆ ـ مبلی ـ گەرایەوە کە لامارتین لە (اکس) زۆر چاوەری کرد ومودەیەك بەسەر ژوانیاندا تێپەری لە هەژمەتان چووە ـ ماکو ـ کە لە سەبەبی نەهاتنی «چولیا» بگات لەوێ پێ‌یان ووت کە مردن کەوتووتە بەینەوە نەی هیشتووە کە «چولیا» بەلینی بهێنێتەجی . ئەم خەبەرە چرای شادیو ئاهەنگی لە لامارتین کوژاندەوە رۆژی شۆرەتو عەزەمەتی لە ئۆفقی ئەدەبدا هەل هێنا «چولیا» . لامارتینو «لامارتین» چولیای بەهەموو عالەم بە ناسیندا .

ژیانی لامارتین :

لامارتین هەروەکو بە دلداریکی مال‌ویران ناسراوە وە نەبێ خەیال پەروەری و شیعر بازی ئەوەی لە دنیای واقیع و خەباتی ژیان دوور کردبێتەوە بەلکو بە عەکسەوە لامارتین خاوەنی دوو شەخسیەتی زۆر بەتێنە . یەکەمیان شەخسیەتی ئەدەبیو لەدنیای دلداریدا زەعیمو پێشرەو بووە . وە دووەمیان شەخسیەتی دنیایی کە کوشش کەرێکی بێ پشوو ماندو بووە ، زۆرقینی لەم کەسانە هەلساوە کە بە تەنها هەرلاییکی کردبێتە مەسلەك بەلکو وای لاساغ بووە کە «شیعر سێبوری‌کەری بە تالیو رازێنەری ژیانە» وە لەلایەکی تریشەوە ئەلێ مەلائیکەتی ژیانو خواردنی رۆژی تیکوشینو رەنجدانە لەبەر ئەمە لامارتین دوور لە واقیعو لەناو خەیالو ئەدەبیاتێکی موجەدەد نەژیاوە ئەگەر وابوایە هینده مەوقیعی سیاسی‌لە «پیرج» بە قوەت نە ئەبوو کە بەبێ ئەوەی لە فەرەنسەبی بە نائیبی ئینتخاب بکری .

## - الطلاسم -

## - ليا ابو ماضي -

جئت لااعلم من اين ولكني اتيت
ولقد ابصرت قدامي طريقاً فمشيت
وسأبقى ماشيا شئت هذا ام ابيت
كيف جئت كيف ابصرت طريقي لست ادري

نازانم له كوێوه هاتم وه‌لێ هاتم
ریگه‌ییکم له‌پێش خۆمادی پێدا رۆیم
گه‌ربمه‌وێو گه‌ر نه‌مه‌وێ هه‌ر له‌رۆیشتندا ئه‌بم
چۆن هاتم چۆنم دیت كه ئه‌مه ریگه‌مه نازانم ؟

أجديد ام قديم انا في هذا الوجود
هل أنا حر طليق ام اسير في القيود
هل أنا قائد نفسي في حياتي ام مقود
اتمنىٰ انني ادري ولكن لست أدري

من كه ئێستا هه‌مه ئایا كه‌ونم یا تازه‌م
ئایا من له كرده‌وه‌م سه‌ربه‌ستم یا به‌كۆتێكه‌وه به‌ستراوم
ئایا له ژیان سه‌رداری گیانی خومم یا لیم ئه‌خورن
زۆر حه‌ز ئه‌كه‌م كه بزانم ، به‌لام ، نازانم

وطريقي ما طريقي أطويل ام قصير
هل أنا أصعد ام اهبط فيه ام اغور
ألنا السائر في الدرب ام الدرب ليسير
ام كلانا واقف والدهر يجرى لست ادري

ئەم ریگەیەم چ رێگەیکە درێژە یان کورتە ؟
بەسەری ئەکەوم یان لێی دێمە خوارێ تیی ڕووئەچم
ئایامن دەڕوم یان رێگەدەروا
یا هەردوکمان وەستاوین ، دەم رائەکا ، نازأنم

ليت شعري وانا في عالم الغيب الامين
اترانى كنت أدرى انني فيه دفين
وبأني سوف أبدو وبأني ساكون
ام ترانى كنت لاادري شيئا . لست ادري

بریا ئەمزانی ئەووەختەی کە لەمی نهێنی ئاسوودەبووم
ئایا ئەمزانی کە دێمەدی وەیا ئەبم ؟ .
ئایا ئەمزانی کەمن لەناو ئەم نهێنە شاردراومەوە
یا هیچ شتێکم نە ئەزانی ؟ نازانم

اتراني قبلما اصبحت انساناً سويا
اترانى كنت محواً ام ترانى كنت شيئاً
ألهذا اللغز حل ام سيبقى أبدياً
لست ادري ولماذا لست ادري . لست ادري

ئایا لەپێش‌وەی کە ببمە ئەم ئادەمیزادەو بێمە ریزەوە
ئایا هیچ بووم یان شتێك هەربووم ؟
ئایا ئەم معملیە حەلێکی بۆهەیە یان تا ئەبەد هەر معملیە
نازانم کە بۆچ نازانم ؟ نازام

«البحر»

«زەریا»

قد سألت البحر يوما هل انا يابحر منكا
هل صحيح ما رواه بعضهم عني وعنكا
ام ترى ما زعموا زوراً وبهتاناً وافكا
ضحكت امواجه مني وقالت لست ادري

ڕۆژێك لە زەریاییکم پرسی ئەی زەریا من لە تۆم ؟
ئایا ئەوانەیمن ولەتۆیتۆی ئەگێرنەوە هێندی کەس ڕاستە ؟
ئایا ئەوانەی کە وتوویان هەموو درۆو بوختانو هەلبەست بوون
شەپۆلەکانی پێم پێکەنینو ووتیان . نازانم

ايها البحر أتدري كم مضت الف عليكا
وهل الشاطئ يدري انه جاث لديكا
وهل الانهار تدرى إنها منك اليكا
ما الذي الامواج قالت . حيث ثارت . لست ادري

ئەی زەریا ئەزانی کە چەندەها زارانت بەسەردا چووە ؟
ڕۆخەکانت ئەزانن کە ئەژنۆیان لەبەرتۆ داوەتەوە
ئایا ڕووبارەکان ئەزانن کە لەتۆن و بۆ تۆش ئەچن ؟
شەپۆلە کانت چی یان ووت ؟ کە تورەبوون نازانم

انت يا بحر اسير اه ما اعظم اسرك
انت مثلي ايها الجبار لاتملك امرك
اشبهت حالك حالي وكما عذري عذرك
فمتى انجو من الاسر وتنجو . لست ادري

تۆ ئەی زەریا دیلی بەلام دیلایەتیت چەند گەورەیە
تۆش وەك من ئەی دلێر خۆت خۆت بەدەست نیە
ئایا حالی تۆ بە حالی من ناچی وغەدرت وەکو هینەکەی من نی یە
کەی لەم دیلیە رزگار ئەبم تۆش رزگار ئەبی ؟ نازانم

قد اكلناك وقلنا قد اكلنا الثمرا
ترسل السحب فتسقى ارضنا والشجرا
وشربناك وقلنا قد شربنا المطرا
اصواب ما زعمنا ام ضلال . لست ادري

تۆمان خوارد ووتمان میوەمان خوارد
هەور ئەنێری و درەختەکانمان ئا و ئەدەیت
تۆمان خواردەوە ووتمان بارانمان خواردەوە
ئایا لەمانەی ووتمان راستمان کرد یان درۆ ؟ نازانم

قد سالت السحب في الافلق هل تذكر رملك
وسالت الشجر المورق هل يعرف فضلك
وسالت الدر في الاعناق هل تذكر اصلك
وكاني خلتها قالت . جميعاً . لست ادري

له هه‌ورم پرسی له ئاسمانان لیمه‌رانت به یاده
له دره‌ختی شینم پرسی ئایا چاکه‌ی تۆی له‌بیره
له خه‌ناوکه‌ی مرواریم پرسی ئه‌سلی خۆت له‌یاد ماوه
هه‌روه‌کو وام هاته به‌رچاو هه‌موو وتیان نازانم

يرقص الموج وفي قاعك حرب لن تزولا
تخلق الاسماك لكن تخلق الحوت الأكول
قد جمعت الموت في صدرك والعيش الجميلا
ليت شعري انت مهد ام ضريح ؟ لست ادري

شه‌پۆله كانت له ره‌قسن ژێره‌كه‌ت شورشێكی به‌رپایه
ماسی ده‌هێنیه‌دی ، حوتی زۆر خۆریش خه‌لق ده‌كه‌یت
مردن و ژیانی زۆر جوانت له‌سینه‌تا كۆ بووته‌وه
بریا ئه‌مزانی تۆ گۆریت یان لانكیت ؟ نازانم

كم فتاة مثل ليلى وفتى كابن الملوح
انفقا الساعات على الشاطئ تشكو وهو ليشرح
كلما حدث اصغت واذا قالت ترنح
احفيف الموج سر ضيعان ؟ لست ادري

چه‌ند كچی وه‌ك له‌یلاو كوری وه‌ك كوری ملوحی
ساعاته‌هایان له‌سه‌ر رۆخه‌كه‌ت به‌سكالاو رازه‌وه رابوارد
وه‌ختی ئه‌م ئه‌دووا ئه‌و گوێرایه‌ل وه‌ختی ئه‌و ئه‌دووا ئه‌م ئه‌هه‌ژا
ئایا خوره‌ی شه‌پۆل نهینی بوردنیان سربیوو ؟ نازانم

كم ملوك ضربوا حولك في الليل القبابا
طلع الفجر ولكن لم نجد الا الضبابا
ألهم يا بحر يوما رجعه ام لاقابا
ام هم في الرمل ، قال الرمل اني . لست ادرى

چەند قەرالان بەشەو چادریان لەدەورت هەلدا
کە رۆژبۆوە بیجگە لە تەم چیتریان لە شوێنەوار نەما
ئایا رۆژێك ئەی زەریا هاتنەوەیان هەیە یان هەروەکو چوون چوون
یان ئێستە لەم لیمەدان ، لیم ووتی من . نازانم

فيك مثلي ايها الجبار اصداف ورمل
انما انت بلا ظل ولي في الارض ظل
انما انت بلا عقل ولي يا بحر عقل
فلماذا يا ترى امضي وتبقى ؟ لست ادري

تۆش وەکو من ئەی قارەمان سەدەف ولیمت تێدایە
تۆ بێ‌سێبەری من لە ئەرزدا سێبەریکم هەیە
تۆ بێ ئەندیشەی من ئەی زەریا ئەندیشەدارم
بۆچی من ئەمرم تۆ دەمینێت ؟ نازانم

ياكتاب الدهر قل لي أله قبل وبعد
انا كالزورق فيه وهو بحر لايحد
ليس لي قصد فهل للبحر في سيرك قصد
حبذا العلم ولكن كيف ادري ؟ لست ادري

ئەی نامەی زەمانە پێم‌بڵێ ئایا زەریانەوو دووایی هەیە
من وەکو قایەغێك تێدا ئەسووریمەوە ئەویش زەریاییکە ئەسووڕێ
بێ مرازم ئایا لە سوورانەوەی من زەریا مرازێکی هەیە
ئاهـ زانین ، بەلام چۆن بزانم ؟ نازانم

ان في صدري يابحر لاسراراً عجاباً
نزل الستر عليها وأنا كنت حجابا
ولقد ازداد بعداً كلما اردت اقتراباً
واراني كلما اوشكت ادري . لست ادري

لەسینەمدا نهێنیێکی سەرسام کەری تێدایە
پەردەییێکی بەسەردا هاتووە ، من ئەو پەردەیەم
لەبەرەوەی تا لێی نزیك ئەبمەوە زیاتر دوور ئەبێتەوە
هەروەکو ئەمبینی ، دیم شتیکی لێبزانم کەچی نازانم

انني يابحر بحر شاطئاه شاطئاك
الغد المجهول والأمس اللذان اكتنفاك
وكلانا صائر يابحر في هذا وذاكا
لاتسلني ما غدما امس ؟ اني لست ادري

من زەمیایکم ئەی زەریا رۆخەکانم رۆخەکانتە
بەیانی ئەدیو دوێنی تۆ یان لە باوەش گرتوە
هەردوکمان لێ خورداوین لەمەش و لەویش
لێم مەپرسە کە بەیانی چی یە ؟ دوێنی چی یە ؟ من نازانم

«الدير»

قيل لي في الدير قوم ادركوا سير الحياة
غير اني لم اجد غير عقول آسنات
وقلوب بليت فيها المنى رفات
ما انا اعمى فهل غير اعمى ؟ لست ادري

«کلیسە»

پێیان ووتم لە کلیسەدا هەندێ کەس هەنە لە نهێنی ژیان گەیشتوون
من بێجگە لە مێشکێکی کرکاوی چیترم تێدا نە دۆزی‌یەوە
دلی لە ئاوات بێبەری وەك ئیسقانی مردوو وابوون
من کوێر نیم ئایا بیجگە لە من کوێرن ؟ نازانم

## - ناگزووری گەلایەتیمان -
## «پێش دەستی»

لەپێش هەموو شتێکا تکا لە خوێندەوارانی خۆشەویست دەکەم ئەمەندەی کە سەیری شێوەی نووسینی کوردی پەتیم نەکەن چونکە مرازم لە نووسیندا ناگزووری گەلایەتیمان خستنە بەرچاوەو بەس .. زۆر لە مێژە . تا ئەتوانم بلێم سێ چوار سال لەمەوبەرەوە من هەوڵ و تەقەلای ئەمە ئەدەم کە بە شێوەیەکی رێك و ئاشکرا ناگزووری گەلایەتیمان «نواقص اجتماعیە» بخەمە بەرچاو ، چەندم پێ خۆش بوو کە کاکە هوشیاریش لەسەر عەینی مرازو رێگەدا هەوڵی ئەدا . تا رۆژێکیان ئاواتمان بۆ ئەمە خواست کە لە گۆڤاری گەلاوێژدا جێگاییکی بە تایبەتی بۆ ئاشکرا کردنی ئەم ناگزووریانە دابنرێ هەموو قەلەم بەدەستێکی کورد وهەمووبرین لە دلێکی تێدا کۆبکرێتەوە .

بەراستی کاك هوشیار لەپێش هەمووماندا زووتر بەلاماری قەلەمیدا لەژمارە ١١ ، ١٢ سالی ٩٤٢ وژمارە ١/٢ سالی ١٩٤٣ گوڤاری گەلاوێژدا رێچکە نووسینی لە ژێر ئەندێشەی کۆمەلایەتی» بلاوکردەوە من یەك لەبارە خومدا وام ئەهێنایە بەرچاوی خۆم کە ئەم باسە وەك ئاگرێك بە تیژی بۆمباییکەوە بنێ ی بەم چەشنە قەلەم بەدەستان رائەپەرێنێ . بەلام هەرچەندێکی ئەم نووسینە کورتەی فایق[*] بۆ تەقاندنی بۆمباییکی باسکردنەوە بەس بوو زۆر بە پەرۆشی یەوە ئەلێم ئەو بۆمبایەی کە هەردووکمان چاوەرێی تەقینمان دەکرد بە چرووك دەرچوو . چونکە ئەم نووسینە بە قیمەتە وەکو نوزەیێکی بێ هیزانە لە قوولایی شیوێکا هاتبێتە دەرەوە لەبەر هەراهەراو دەنگە دەنگی ناوە خۆمان کەس گوی لەم دەنگە ژیان ئەنگێزە نەبوو . لەم رۆژانەی پێشو دەستە هاوملێك لە شوێنێکا دانیشتبووین باسی هەلگیرسانی و ئەسبابی جەنگی گشتی - حربی عمومی - دووەومان دەکرد زۆرم سەرسورما کە ئەم لاوانە وەکو سیاسێکی ئینگلیز وەیا گەل پەرستێکی ئەلمان وەیا جانفیدایێکی روسیا لە ناگزووری سیاسی و ئیقتیسادی تەوازونی دوەلی شارەزابوون . هێندێکیان هێندە بە شارەزایی خۆی بایی بوو کە

وەکو پیغمبەرێك پاشەرۆژی ئەم جەنگەو نـەتائیجی سیـاسیو ئیقتیسادی بـۆ ئاشکرا دەکردین . بەلام داخم ناچی لە مودەی چوار سەعاتدا کە هەمووی بە قیرەقیرو چەندوچوونمان رابوارد ساتێك خۆمان نەکەوتە یادو ئەمەمان نەهاتەوە بیر کە ئێمە کوردینو پێویستە کە لەپێش ئەوەی لە لاییدە وورد دەبینەوە لە خۆمان ووردبینەوە ئەمە ئەڵێمو من حاشا لەمە ناکەم کە پێویستە ئینسـان ئاگـای لە دەوران دەوری خۆی بێ بەلام لە گێژەلوکەی هەراهەرای ئیمرۆ هەرکامێکمان خۆمان لەیاد بچێتەوە گوناهێکە کە مانەندی لێ بووردن نیە .

هەندێکتان وا ئەزانن کە لەباس چوومە دەرەوە ، مرازی ئەساسیم لە یاد کردووە . (نەء) مەسئەلەی ناگزووری گەلایەتی هەموو رۆێکی تێدایە . هەموو ئاوازێك دەبەخشێ ، یەلکوگەلایەتی گەل پەرستی یەعنی کەمو کورتی ئەم گەلانە هێنانە بەرچاوە .

گەورەکانم خوێندەواران ... برایانی لاوانی خوێن گەرم .

هەروەکو (کوستاولوبون) لە کتێبەکەیدا کە ناوی (روحی سیاسەتـە)دا ئەڵێ : ئادەمیزاد بە ووتاری عاتیفی زیاتر لە ووتاری ئەندێشە ئامـێز دێتە بەرهەم و لێخورین ئەم ووتارە نایابەی کوستاولوبولم لێرەدا بەیان کـرد تا ـ مقـدماً ـ پێشەکین ـ جوابی لە ووشەی ئاگرینی نیشتمان پەروەری زیاتر گوێی بۆ هیـچ چەشنە ووتارێکیتر کلور ناکەن . ئەمەوێ کە لێرەدا حەقیقەتی بە هەلە چوونی خۆیانیان تێ بگەیەنم . ئەویش بە ریگایێك دەبی کە ئەبێ دەستی ئەم لاوانە بگرم لە ئاوینەی راستیدا خۆی نیشان بدەمو پێی بلێم کاکی خۆم .... تۆ ئەمەیت ـ ئێمە لەم حالەداینە .، گەلی کورد ئەم گەلەی کە هەزار سالەو زیاتر چەشن چەشن دەردو سەنگە ساری رووی تێکردووە . لە لەشیدا جێگیر بووە وەکو نەخوشییەکی موزمین میکرۆبەکانی تیکەل خوین بووەو لە گەلێك مەزایای میللەتی شۆراندووە چونکە هەرچەندێکی بۆ ئیسپاتی هەموو میللەتێك دوو شت کـافیە کـە ئەویش زوبانو سنووری جوغرافیە بەلام بۆ ئەمەی میللەتێك بتـوانی داوای پێ بکات زوبانی دەوێ گەلێك شتی ئەوتوی دەوێ کە ئیستـاکە نـاتوانم بیـان ژمیرم . هەروەکو عەرزم کردن ، میللەتی کورد خاكو زوبانی هەیە بەلام لەگەل ئەمەش بە نەبوو دانراوە . میللەتی کورد مەوجوودە بەلام نەخۆشە ، گیانی تێدایە بەلام ناتوانێ راست ببێتەوە زوبانی هەیە بەلام ناتوانێ بدوێ چاوی هەیە بەلام نابینی گوێی هەیە بەلام نابیسێ ئەتوانم کە میللەتی کورد وا دانێم کە تازە گرانە تای

بەردابێ بەلام لە تەوژمی ئەم نەخۆشییە مێشکی تیك چوو و چاوی گران و گوێ کەرو زوبانی لەنگ بووبێ . هەروەهاش مێشتاکە لە جیگادا کەوتبێ و نەتوانێ راست ببێتەوە ، لەبەر لاوازی و بێ تاقەتی خۆی ، هەرکەسێك لەم حالەی کە ئەم نەخۆشە تێدایەتی داوای ئیش و کارو راپەرین و و جولانەوەی لێ بکات بێشك مرازی لە کوشتن زیاتر چیترنیە .

خوێندەوارانی پزیشکەکانمان ئەمە زۆر چاك ئەزانن کە ژیانی نەخوشێکی کە لە دەوری چاك بوونەوە ـ نەقاهـەت دابێ . گەلێـك لە ژیانی نـەخوشێکی نەخۆش خەتەر ترە . چونکە چاك بوونەوەی نەخوشێکی نەخۆش بە دەرمان و دەرزی باشەوە بەستراوە کە ئەویش کاری دکتۆرێکەو بەس . بەلام نەخوشیکی لە دەوری نەقاهەت دابێ ژیان و هاتنە سەرەخۆی بە خواردنی باش و رێکی دانی ئەم خواردەمەنیانە بەستراوە کە ئەمە لە موراقەبەی دکتور بەدەرە زۆر مومکینە چەشنە خواردنێك بۆ نەخۆش دائەنێ بەلام نەخۆشەکە خۆی حەز لەم خواردنە ناکات و داوای یەکێکی تر دەکا . خزم و کەس و کاری لەبەر خۆشەویستی وەیا لە نەزانینا بە گوێی دەکەن نەخۆشەکەی لێ هەلدەوەشێتەوە بۆ ئەمە پێویستە کـە دکتور زانی نەخۆشەکەی لە دەوری چاکبوونەوەیە زۆر بە ووردی بی هیـزی لەش و مەعیدەی نەخۆشەکە تەقدیر بکات بزانێ کە چ چەشنە خواردنێکی سووك زووترو زۆرتر هیزی ئەداتێ . هەرئەوە بۆ چاککردنەوەی نەخۆش بەس نی‌یە بەلکو پیویستە کە ئەم کەسانەی خواردن ئەدەنە نەخۆش بزانن کە چ دەکەن وزۆر بە دیقەت میقداری خواردن و دەم و جەمی بۆ رەچاو بکەن . هەرکامێکیان لە کاری خۆیاندا درێغیان کردوبایە بە هەلەچوونی بێشك ئەم نەخۆشە لە پاش چاك بوونەوە ئەکوژن وەیا دووبارەکی تووشی نەخۆشی یەکەی جارانی وەیا نەخۆشیکی لە هین جارانی گرانتر دەکەنەوە .

ژیانی میللەتێك وەکو ژیانی فەرد وایە هیچ فەرقی نیە . هەر چونیکی ئەو بەنەخۆش دەکەوێ ئەویش بەنەخۆش دەکەوێ . وەبۆ چاك کردنەوەی دکتوری دەوێ . دەرمانی گەرەکە .

# ناگزووری کەلایەتیمان

## «خێزانداری»

١ - لەسەر رووی زەمیندا . لەمەیدانێکی وابەرین ، زۆر لە مێژە ئـادەمیزاد وەکو گیان لەبەرێکی ئەم گیان لەبەرانەی کە لە پێش چاوە ئەژین تا ئێستا زانایانی عیلمی حەیات وە عیلمی حەیوان نـەیان تـوانیوە ئـەمە بهـاوێنە سـەرپەرەی حەقیقەت کە چۆن وە بەچ جۆرێك تیرەی ئادەمیزاد هاتۆتە دنیاوە . گەرچی لە ئاینەکاندا باسی هاتنی ئادەمیزاد بۆ دنیا زۆر کراوە . وە لەم دووایییەدا بە هۆی نەزەریەی داروین مەسئەلەی داری ژیان - «شجرة الحياة» رەوشەن کرایەوە . بەلام لە حەقیقەتدا بنەچەی هاتنی ئادەمیزاد عیلمیەن هێشتـاکە شتێکی زۆر پەنهانی‌یە هەرچۆنێکی ئادەمیزاد هاتبێتە سەر رووی دنیا باهاتبێ چ بە میکرۆبی حەیات - میکروبی گیان لەبەر - وە ئەم مەسئەلەیە بەستراو وەیا بـە ئادەم و حەوا هەلواسرابێ یا هەلواسرابێ ئێمە مرازمان ئەمە نیە کە لە نبەچەی هاتنی ئادەمیزاد بۆ سەرزەمین ئاشکرا بکەین بەلکو مرازی هەرە گەورەمان ئەمەیە کە بزانین ئایا ئادەمیزاد چۆن کەوتە سەر وینەی کەلایەتی - اجتماعي .

٢ - لای هەموو زانایانی میژوو - تأریخ - ئەمە ئاشکرایە کە سەر وەختێك بووە کە ئادەمیزاد لەسەر دنیا زۆر کەم بوون و بە تاقی ژیاون لەو زەمانەدا ئادەمیزاد لەگەڵ ورچێکی - حیوان - کیویی - وەحشی - چ فەرقی نەبووە فەرد بە تەنها چووە راوی کردووە و هەر بۆ خۆی خواردویەتی لەهەرگیرو وەرگێری تەبیعەتدا پەنای بردۆتە بەر دەستو بازو تێنی تایبەتی خۆیەوە . لەبەر ئەوەی کـە زۆر ئیبتیدائی ژیاوە . ئیحتیاجاتیش زۆر کەم بووە ولەبەر ئەوەی کە هەموو شتێکیش زۆر بووە وە معاف بووە چ حاجەتی ئەمەی نەبووە کە میشکی خۆی ماندو بکات لێوورد بوونەوەی بـەتین بکـات لەبەرئـەمە مـەجالی تـەفکیریشی لە دائیـرەی ئیحتیاجاتی نەفسی خۆی تێنەپەڕ بووە . گەر بە چاوێکی مەنتیقی سەیری ئەو دەورە بکەین ئەبینین کە ئادەمیزاد هیشتاکە (خیزانداری) نەزانیوە - ئافرەت هینی کەس نەبووە . هەروهاش مندال باوکی خۆی نـەناسیـووەتەوە ، بـەلکو

منـدال دایکی ناسیـووەو دایکش زۆر دلسۆز نـەبووە ، بـەلکو هــەر هیندەی پاراستووەکە مندالەکەی گەیشتووتە دەسالان وەیا کـەمتر ئـەوجا بـەرەللای کردووە وتەسلیمی دەستی تەبیعەتی کردووە . مندالیش لەودەوردا زۆر هۆگری دایکی نەبووە بەلکو بە هەلاش بوونی دایکی بەجێ هیشتووە بە تەنها ژیاوە .

٣ - بە دوور و دریژایی زەمان ئادەمیزاد زیادی کردووە و دایك مندالی زۆر بووە و تیرەی ئادەمیزاد هەستی لێوورد بوونەوەی زیاتر بووە بەمە ئادەمیـزاد ئەو شوینەی کە لێی لە دایك بووە لە دەورو گری جیاواز نەبۆتەوە ، بە رۆژ چووین راویان کردووە و بەشەو لە ئەشکەوتەکاندا و لەسەر دارەکانی بەرز نووستون مندالیش لە بچـووکی و گـەورەیی دا لە دایکی دانـەبـراووە خـۆشـەویستی لەیادنەچۆتەوە چاکەی لەبیرنەکردووە ، بەمە دایك و رۆلەکانی پیکەوە ژیاون ، پیکەوە چوونە راو ، پیکەوە خۆیان پاراستووە ئەمە ئەساسی ئەم (نظریە) یە کە دەلێن خیزان لەسەر سـەری دایك دامـەزراوە . یەعنی دایـك دامەزرینـەری خیزانە .

لە لاییکی تریشەوە نەزەریەییکی تر هەیە کە دەلێن پیاو - نێر - کە تووشی ئافرەت هاتووە - مێ - لە دووای بەیەکتر گەیشتنیان پیاو ئافرەتی بۆ خۆی زەوت کردووەو لێی دانەبراووە ، هەرکیز لەدوای نەبۆتەوە تا پیکەوە هۆگریان گرتووە بەمە بناغەی خیزانداری دامەزراوە . ئەگەر بە ووردی سەیری ئەم نەزەریەش بکەین سەیر دەکەین دیسان لە ئافرەت دوورناکەویتەوە ، دیسان بناغەی خیزان هەر ئافرەت بووە . بەلام نەزەریەی یەکەم لەگەل نەزەریەی (نشـوء وارتقاء) زیاتر ریك دەکەوێ .

٤ - بەزۆر بوونی ئادەمیزاد ، زیـاد بوونی خیـزان وە پەرەسـەندنیـان ولق لێبوونەوەیان و زاوزێی بەردەوام خێل - عەشیـرەت - یان هینـاوەتە دی ئـەم خیلانە هەروا نەبێ لە جیگاییك ژیابن . بەلکو بەپێ زۆربـونیان و پێـویستیان لەیەکتر دورکەوتوونەوە . وابووە چەند بەرە دایکێك بە لاییك کۆچیان کردووەو لە شوێنێکا جیگیربوون . بەمە بەرەبەرە بلاوەیان ساندووەو کۆمەکیان بەستووە .

٥ - بەزۆر بوونی عەشیرەتان و یەکتر ناسینیان و بە زوبانێك دووانیان . چەند عەشیرەتێکی کە لەیەك بنەچەك پەیدابوون لە شوێنێکی تایبەتێ ژیاون . بەمە (گەل)یان هێناوەتە وجود لەم نووسینەدا سەر سـەرەکیانـەی سەرەوە لامـان بەدیار دەکەوێ کە ئامیزاد تا گەیشتوتە رادەی ئیمرۆکە چوار مەیدانی بریوە کە

مەیدانی یەکەمی ژیانی تەنهایی مەیدانی دووەم ژیانی خیزانداری مەیدانی سێیەم خیلایەتی‌و مەیدانی چوارەم گەلایەتی‌یە بەلام وانەبی فەرد لە ژیانی دوواییدا خۆی لەیاد چووبێتەوە بەلکوسەیری خۆمان بکەین سەیر دەکەین هەر فەردێك لە ئێمەدا لە ژیانی خۆی مەسئوولە . ئەبێ کە گەبشتە عومرێکی موعەین لەسەر شانی کەسدا نەژی . خۆی ڕێگاییکی تایبەتی لە ژیاندا بدۆزێتەوە ئەمە هەرە پیشترینی پیویستی ئادەمیزادیکە . لە دووا جارا وانەبێ هەر کامێکی ئێمە لە خۆدا هاتبیتە دی . بەلکولێرەدا سەر بە دایك‌و باوك وبراو خوشکە . ئەمانە کە خیزانن لە دووای فەردا موباشەرەتەن لە موقەدەراتی یەکترو خۆیان مەسئوولن‌و لە یەکتر دانابرێن دیسان دایك‌و باوکان دایك‌و باوك خوشك‌و برایان هەیە ئەوانیش ئەوانیان هەیە ئیتر هەروەها کومەلە خزمێك کە لە ئامۆزاو بن ئامۆزاو پورزا هاتووتەو جوود .

بەرەبابێکیان هێناوەتە دی وە لە چەند بەرە بابێك عەشیرەت هاتووتە وجودو لە چەند عەشیرەتێك قەوم ـ گەل ـ پەیدابووە ئەمەی کە عەرزم کردن وێنەیێکی زۆر موختەسەری ئەم (نظریە)یە کە چۆنی یەتی هاتنە وجوودی گەلانی پێزانراووە . ئەم نەزەریەیە لە واقیع‌و مەنتیق دوورنەکەوتووتەوە .

( ) دلدار بەنیاز بووە بەپێی ئەو پرۆگرامە لەسەر هەر بابەتێك لەو بابەتانەوە نبووسی‌و چارەسەریەکی زانستیانەیان بکان .. بەلام بەداخەوە مەرگ ئەو ئارەزووەشەی لەگەل ئاواتەکانی تری پێ بردە ژێر خاکەوە .

## - پروگرامی ناگزوری گەلایەتیمان -

## خیزانداری

---

١ - چۆن خیزان دامەزرا ؟

أ - نەزەریەی دایك ، ب - نەزەریەی باوك ، ح - نەزەریەی ئەزەلی

٢ - چۆن گەل دامەزرا ؟

٣ - گەل و (تنظیم)

٤ - تەنزیمی خیزان

٥ - عەقدی ژن هێنان .

٦ - مەوزوعی ژن هێنان .

أ - ئافرەت :

١ - ئافرەتوگەل ٢ - ئافرەت لە تەئریخدا ٣ - ئیعتیقادات بەرامبەر بە ئافرەتو ئەسبابی ٤ - حەقیقەتی ئافرەت ٥ - ئافرەت ئەساسی کۆمەڵە

أ - ئافرەت حیلە بازە ، ئەسبابی

ب - ئافرەت سپلەیە ، ئەسبابی

ح - ئافرەت دوو روو فیتنە جۆیە ئەسبابی

٦ - خیصالی ئافرەت ٧ - ئافرەت لە حەقیقەتدا ٨ - ئافرەتی ئیمرۆ

ب - پیاو : ١ - ئەهمیەتی پیاو لە گەلدا چیە ؟ ٢ - پیاو لە چاوی ئافرەتدا ٣ - ئەسبابی سوئی زەنی ئافرەت لە پیاودا چیە ؟

٧ - ئەرکەکانی عەقدی ژن هینان .

أ - / ب - / ج - / د -

٨ - تەبیعەتی عەقدی مارەیی

٩ - ئەنواعی ژن هێنان أ - ژن بە ژنی کردن ب - ژن لە خوێن دان ح - ین پشك د - ناوك برا

١٠ - نەتائیجی ئەم شیوانە یەك بەیەك

أ - / ب - / ج - / د -

١١ - شەرو شۆری خیزان : أ - ئەسبابی کەسەر بە ئافرەتە
ب - ئەسبابی کە سەر بە خیزانە
١٢ - تەئسیری ئەم شورشی‌یە لەسەر مندالدا
١٣ - قەواعیدی عەدالەت و ژن هێنان .

## ناکزوری گەلایەتی - خێزانداری -

### ١ - چۆن خیزان دامەزرا ؟

بۆ ئەمەی کە چاك لەم باسە وردەی سەرەوە کە (خیزانداری)یە بگەین زۆر پێویستە کە لە بنەچەی خیزانداری وچۆنی دامەزراندنی بهاویشترێتە بەرچاو . بەراستی پاسخی ئەم پرسیارەی سەرەوە کە ئەلێن - چۆن خیزان دامەزرا - زۆر گرانە چونکە بۆ زانینی حەقیقەتی ئەسبابی دامەزراندنی خیزان و عەوامیلی کارکردەی پەنا ئەبردرێتە بەر میژوو - تاریخ - میژوو ئەم پاسخەی هاویشتووتە سەر شانی خۆی . بەلام عیلمی میژوو دوو وەسیلەی هەیە ، یەکەم وەسائیلی مادی کە موستەنەداتی تەئریخیە کە ئەویش شوینەواری ئادەمیزادانی پیشوو نووسینیان و حالەتی ئیجتماعیان و ئاینیان ئاساریانە .. دووەمیان ئـەم (نظریـا تانەیە) کە زانایانی میژوو پەنهانی پێش میژووی - (ما قبل التاریخ) - پێ ئاشکرا دەکەن مەسئەلەی چۆن خیزان دامەزراوە لە بەشی دووەمیدا . وە بۆ زانینی ئەمە ئاینەکانیش زوبانی پاسخیان تێدا سووراندووە لەبەر ئەمە پیویستە کـە لەیەك بەیەکیان بدوین .

#### أ - نەزەریەی دایك :

زانایانی میژوو عیلمی ژیان پیکەوە ئیستنادەن لەسەر (نەزەریەی نشوء و ئیرتیقاء) ئەلێن کە ئادەمیزاد ئەم ئەندیشەی و ژیانەی کە ئیستێکە هەیەتی بە دوورو دریژایی سالان و تەجروبە بۆ خۆی پیکەوە ناوە . یەعنی رۆژێك بووە کە ئادەمیزاد وەك دەعبایێکی کیوی ژیاوە . هەرکەسە بۆ خۆی بووە ئادەمیزاد بە تەنها چۆتە راو راوی کردووە و هەر بە تەنهاش خواردوویەتی لەو زەمانەدا ، ئادەمیزاد لە خانواندا نە ژیاوە و هەروهاش شوینێکی بە تایبەتی نەبووە ، بەلکو لەگەڵ نێچیرگەراوە . لە هەرگیرو وەرگێری تەبیعەتدا پەنای بردۆتە بەر دەست و بازوو تێنی تایبەتی خۆی .

لەو دەورەدا . ئادەمیزاد خیزانداری نەزانیوە . ئافرەت بە تایبەتی هین کەس نەبووە . بەلکو وەك حەیوان بێ پەیرەو وبێ نیزام ژیاون مندالیش لەو دەورەدا باوکی خۆی نەناسیوەتەوە بەلکو هەر سەربە دایکی بووە . دایك مندالی بووە تا گەیشتووتە عومرێکیوا کە توانیویەتی سەربەخۆ بژی ، چاودیری کردووەو بەخیوی کردووە ، کە مندال هەلاش بووە بەرەللای کردووە وازی لێهێناوە . بەلام بە دوورو درێژایی زەمان بەپێی (نشوء وارتقاء) ئادەمیزاد بەرە بەرە بەسوورەتیکی تەدریجی شێوەی ژیانی جارانی فرێ داووە . خێزانیان هێناوەتە دی ئەویش هەموو گیان لەبەرێکی (مێینە) هەر لە خوداوە چەشنە دلسوزێكو خۆشەویستێکی زۆر بەتینی بەرامبەر مندالەکانی هەیە ، بێگومان خۆشەویستی ئافرەت بۆ مندالەکانی لەخۆشەویستی باقی حەیواناتی تر زۆر بە تینتره لەهۆی ئەم هیزە خوداوەندیە دایك لە دووایی ئەمەی کە مندالەکانی ساوای بەخێو دەکردن لەسەرماو لە گەرماو دەعبایانی دروندەی دەپاراستن لە گەورەیشدا لە خۆی دانەبراندن هۆی هەرە گەورەترینی ئەم دانە برانە هەستی ئەم خۆشەویتییە بەتینە بووکە مندال بەرامبەر دایکی هەستی پێدەکرد .

وە دووەم : پیویستی ژیان وای دەخواست کە بە کومەگی بژین جا ، لە دووای پیشکەوتنو گۆرانی ژیان - ژیان خۆی ناگورێت بەلکو وەسائیلی ژیان لەگۆرانو ئیحتیاجاتی زەروریەی لەزیادیە کۆمەلە مندالێك لەگەل دایکیان لەو شوێنەی کە لیی لە دایك بوون لەسەر وێنەیکی خیزانیو کۆمەکی لەبەر گوری خۆشەویستی دایكو رۆلایەتیو خوشكو برایەتی پێکەوە بەسترابوون ژیاون بەهۆی ئەم نەزەریەیە زانایانی میژوو ئەلێن ، لە دووای کە دایك خیزانی دامەزراندو ژیانی ناوە خۆیانی رێك خست چەند وەختێکی پێچوو ئینجا «باوك» وەك عونسرێکی دووەمین هاتە ناو خیزانەوە تاوای لێهات خیزان بێ «باوك» شیوەی خیزانداری نە دەکەوتە سەر بەمە دووشتیان لێ بەدیارکەوت .

یەکەمیان : مندال : لەژیانی پیشوو ئادەمیزاد لە پیش ئەوەی کە باوك بناسێ دایکی ناسیوە .

دووەمیان : دایك بناغەو بنەچەی خیزانە .

نەزەریەی دایك - ئەساسەکەی ئیستینتاجاتی مەنتیقی (نشوء وارتقاء) ئادەمیزادە یەکەم و دووەم ژیانی حەیواناتی دەرەجەی دووەم کە (مەیموونە) بۆتە قیاسێکی عیلمی ئەم نەزەریەیە . چونکە مەیمون وەکو ئینسان تێدەگا

وەشتی لەفکر ناچی وەتینی لاساکردنەوەو عاتیفەی زۆر لا بەقوەتە ، زانایانی «عیلمی حیوان» سرنجیان داوەتە ئەمەی کە مەیمونی ساوا لە گەورەیشدا هەر سەر بە دایکیانن‌و هیچ وەختێك باوکیان بە پولێك ناکرن ، بەلام وانەبی ئەم نەزەریە مامۆستای یەکەمی عیلمی تەئریخ بێ بەڵکو بەرامبەر ئەم نەزەریەیە نەزەریەیێکی ترهەیە کە ئەلێن (خیزان لەسەر سەری باوك دامەزراوە) ئەویش .

## ب ـ نەزەریەی باوك

لەو وەختەی کە ئادەمیزاد بێ پەیرەو بێ بەستی (قیود) ژیاوە ئەو وەختەی کە کەس بێجگە لە خۆی بۆ کەس سەری دانەنواندووە تێن (قوة) براگەورەی هەموو لایێك بووە . لەو وەختەدا ئادەمیزاد هەموو پیویستێکی خۆی بە قوەت تەئمین کردووە . ئافرەت‌و پیویستی تر بۆپیاو وەکو یەك بوون . چۆن پیاو کەبرسی بووە لە دووای راوگەراووە وە بەدەست‌و بازووی خۆی نێچیری گرتووەو خواردویەتی هەروەهاش پیاو بۆ دامرکاندنی شەهواتی زیندەگی ـ حیوانی ـ بەرامبەر ئافرەت قوەتی بەکارهیناوە لەبەرئەوەی کە هەلشاخان‌و کینەجوي هەموو ئادەمیزادێك هەیە وە تەبیعی لەو وەختەدا گەلێك تونـدو تیژتر بووە . شتێکی زۆر تەبیعیە کە پیاو بەهۆی تینی بازووی خۆی ئافرەتی بۆ خۆی زەوت کردووە . بۆ ئەوەی کە لەلایەن پیاوێکی تر پەلامار نەدرێ هەرگیز لیێ دانەبراوە ، هەرگیز لەدووای نەبۆتەوە ، ئیتر کە ئافرەت زاوەو مندالەکانی ساوابووە ، پیاو گۆشت‌و میوەی بۆ هانیووە ، ئافرەتیش ئەشکەوت مالین‌و پیستە دروونەوەو جێگا چاکردنی گرتۆتە سەرشان بەم گویرەیە بە دوو رو دریژایی سالان ئەمە بۆتە عادەت کە پیاو بچێ لە دەرەوە ڕاو بکات‌و ئافرەت لە مالەوە ئیستراحەتی تەئمین بکات‌وە ژیانی ژن‌و میردایەتی بە وینەییکی ئەوتو دابمەزرێنن کە ئەگەر هات‌و ئافرەت لە جغزی ئەم عادەتانە چووە دەرەوە تووشی کوشتن‌و پەشمەو ناموس چوون ببێ بەم گوێرەیە خیزان دامەزرا . دانەرانی ئەم نەزەریەیە نەفسیەتی ئادەمیزادی زیندەواری . حیوانی ـ کە حەسادەت‌و فیتنە جۆیی‌یە وە قوەتیان کردۆتەدار وە کازی ئەندیشەیان بەهۆی ئەم نەزەریەیە ئەتوانین کە لە بێهێزی ئافرەت‌و کەساسی بەرامبەر پیاو بگەین بەهۆی ئەم نەزەریەیە لە دووای ئەمەی کە ئافرەت کاروباری مالەوەی گرتە سەرشان‌و بە

خێوکردنی منداڵەکانی گرتە ئەستۆی خۆی . وە ئەم کارانەی کردە عادەت بەو هۆیەوە زۆرترین خاسیەتی زیندەورانی تەبیعی خۆی کە هەیبوو وونی کرد .

مەسەلەن : لەمەوبەر لە هەموو کاروبارێکی ژیاندا ئافرەتیش وەکو پیاو بەهۆی بازووی خۆیەوە دەرچووە ، راوی کردووە . خۆی پاراستوە منداڵەکانیشی پاراستوە ، پیستەی بۆ دروون جێگەی گەرمی بۆ ئامادە کردوون بەلام کە پیاو زەوتیُ کردو بەکۆتی خێزانداری بەستی‌یەوە خاسیەتی راوکردن و خەباتی ژیانی لە دەست چوو . لە دووای ئەمەی هەر بە خۆیەوە ئەژیا . وای لێهات بۆ پاراستنی خۆی پەنا بباتە بەرپیاو .

مەسئەلەی ئافرەت ونکردنی خاسیەتی خەباتی ژیانی هەر بە زیندەوەرانی مالی ـ حیوانات الألیفە ـ دەچێ . مریشك جاران وەکو باز ئەفری بەلام لە دووای ئەمەی کە ئادەمیزاد گرتی‌و لاوانری‌یەوەو دەستەمۆی کرد . بە دووردرێژایی سالان فرینی لە یاد چۆوە . خاوەنانی ئەم نەزەریەیە ئەلێن ، ئەگەر دایك دامەزرینەری خێزانبایە ئەبایە گەورەیی‌و حوکمرانی خێزانی هێندێك بپاراستیایە ، واقیع نیشانمان ئەدا ، هەتا لە تەئریخیشدا ئافرەت لە کۆمەلدا وەك نەبووبی وایە ، یا وەك حەیوانێکی جوان لە ماڵەوە دانیشتووەو خزمەتی کردووە . تا ئێستاکەش لای هێندێ لە گەلانی دوواکەوتوودا ئافرەت وەك مەروبزن‌و چێل ئەکرێ و ئەفرۆشێت بەلێ ئافرەت وەك پیاو بەتین بووە خەباتکەرو درو لێدەر بووە بەلام کەسەری دانواندرا جارێکی‌تر بەرامبەر تین‌و زۆرداری پیاو سەری بەرزنەکردوتەوە ، هەتا هاتووە زیاتر کەساستر بووە ، تا ترسنوکی وبێ مەقدەرەتی‌و پەنابردنە بەر دەست‌و بازووی پیاوی لێبووە خاسیەتێکی تەبیعی کە بە ئاسانی لاچوونی لە قەوامدا نیە . ئەمەی کە عەرزم کردن . کە نەزەریەی باوکە ، ئەگەرچی بە پێی تەحلیلی مەنتیقی‌و خەسائیسی حەیوانی زۆر راستە بەلام وانەبێ کە زانایەکان دلیان بەمە ئاوی خواردبێتەوە ، بەلکو بۆ تەفسیری ئەسبابی دامەزراندنی خێزان نەزەریەیێکی تریان داناوە کە ئەویش بە نەزەریەی (ئەزەلی)یان (قانونی طبیعی) (Natuil Law) ئەناسرێ .

کردگار ، وەیا تەبیعەت کە ئەم هەموو زیندەگانی‌یەی هیناوەتە وجود هەمووی سەریان بۆ قوەتێك دانواندووە کە نیزامی تەبیعیە بەهۆی ئەم قوەتە «شتیالی»و زیندەوار لە زاوزێ و زیادیدایە ، و بۆ زیادکردنی جنسی هەر چەشنە شتە وەسیلەیێکی تایبەتی خۆی هەیە ئەم وەسیلانە ئیختیاری بێت بەلکو

رەغبەتێکی دەروونی هەموو حەیواناتێك دەهاویتە سەر ئەمەی کە (ئیلتیجا) بەم وەسیلەیە بکەن . لە نەتیجەی کردەوەیان زاوزێ هاتووتەدی . «سکس ئەپیل» یەعنی (جازبیەی شەهوانی) لە ژن و پیاودا بەهۆی قانونی تەبیعەتەوە هەردووکی هەر لەئەزەلی یەوە هاویشتۆتە سەر ئەمەی کە پێکەوە بژین و هەردەم لە نێزیك یەکتربن و لەیەك جودانەبنەوە لەبەرئەمە تەسەورکردنی رۆژێك، کە ژن و پیاو بە تەنها ژیاوە زۆر بە هەلە چوونە بەلکو خیزانداری ئیبتیدای نیە تەسەوری ئینسان کردنی پێویستە کە خێزانیش لەگەل تەسەور بکرێ . نەزەریەی قانونی تەبیعی وە تەبیعەتی ئادەمیزاد کە زیندەواریکە لەلایەن هەموو ئاینانی دنیاوە پێ لێنراوە تا ئاینەکان ئەلێن کە تیرەی ئادەمیزاد لە مەخلوقاتی تر بەرزتر . و پیرۆزترە هیچ وەختێك وەك حەیواناتی دروندەو عادی نەژیاوە بەلکو لەگەل خولقانی ئاین و پەیرەو نیزامیشی لەگەل دانراوە بەلام ئەم ووتارە لەگەل مەنتیقی عیلم و تەئەوری .

موستەمیری شێوەی ژیانی ئادەمیزاد رێك ناکەوێ ئەم سێ نەزەریانەی کە عەزرم کردن هەرسێکیان جیا جیا چەشنە ئیستینتاجێك و ئەندیشەیێك ئەخاتە سەر عیلمی تەئریخ و هەروهاش چەشنە رۆناکاییکی ئاشکرا ئەهاویتە سەر ئەم پەنهانیانەو زەواهیرانەوە کە لەپیش چاومانن . بەلام بۆ زانینی ئەسبابی خیزان دامەزراندن ئیلتیجا بە نەزەریەیێك کردن بە هەلە چوونە چونکە هەروەکو هەریەکەیان لە مەنتیقی خۆیاندا زۆر مەعقوولن بەلام لە ناتەواویش بێبەری نیە .

# دڵداری شاعیر

بەڕاستی دلدار شاعیرێکی هەلکەوتەی بەرزو بەهرەدار بووە ، هەر لە ڕۆژانی منداڵی‌یەوە شەیدای شیعرو ئەدەبیاتی کوردی بووە . وەهێوێنی کاریگەری بوونە شاعیری دڵدار لە یادداشتەکەیدا ئەوەی بە جوانی بۆ ڕوونکردینەوە هەرچەندە زۆر لە نووسەران لەسەر شاعیریەتی دوواون ، بەلام ئێمە لەسەر ڕەوشەنایی دەست خەتەکەی خۆی کە چاکترین سەرچاوەی ڕاستی‌یە دەڵێین دوو شتی سەرەکی‌و بنچینەیی کاریان کردۆتە سەر بوونە شاعیریەتی دڵدار یەکەم ، دیمەنی چاو ئەندازی رازاوەی کوردستان : کە بە ڕادەیەك هەستو سۆزو بیرو خەیالاتی داگیرکردوە ، وەك دولبەرێکی نازەنین خوێنی گەرمی لاویەتی بزواندوە .. سەیرکە چەند بەسۆز ڕوو دەکاتە بەهەشتی پڕ لالەزاری کوردستان .

کوردستانی خۆش نیشتمانی جوان
تۆ قیبلەگاهی منی بێ گومان

چاوم پشکوتووی شاخەکانتە
فێری ژیانی باخەکانتە

دەنگی شمشالی شوانەکانت
قاسپەی کەوانی قەد کێوەکانت

خورەی ئاوەکەی نشێوەکانت
ئەمانە هەمووی گوێیان کردمەوە
هێوینی شیعری دلیان گرتمەوە

ئیتر هەر ئەو خۆشەویستی یەی خاکی جوانی کوردستان بۆتە هۆی ئەوەی کە نازناوی خۆی بنێ (دلدار)

لەبەرئەوە سەیر دەکەین هۆگرو مەفتوون بوونی شاعیر بو خاکی کوردستان لە زۆربەی بەرهەمەکانیا خۆی دەردەخا .. هەروەها لە یادداشتەکەیا باس دەکاو دەڵێ :

« لە دوواجار تووشی نەخۆشی مەلاریا هاتم ئیتر مەلاریا سەری تێکردم رۆژێك چاكو چوار رۆژ نەخۆش بووم لەگەل ئەمەشا رانیەم هەر لا خۆش بوو ، خاسەتەن زۆر مەفتوونی (قولە) بووم ، قولە ئەم کانی یە بەرینەی ئاو رۆنەی بەفراوە ، هەموو مەشاعیری لێ زەوت کردبووم هەر کە چاك ئەبوومەوە خیرا ئەچوومەوە سەر قولە »

کەم کەس بە رادەی دلدار جوانی سروشت لەسەر هەستو هۆشو بیری کاریگەر بووە ، سەیرکە چەند بە سۆزو هەستی ناسك ، باسی گەشتەکەی کویەو رانیەمان بۆ دەکات .. وەك هونەرمەندێکی بەهرەداری لێهاتوو تابلۆی وێنەی جوانی سروشتت بۆ دەکێشی دیمەنی پر لالەزاری بەهاری رەنگینی بناری کیوی هەیبەسولتانو دەشتی بیتوێنو چیا سەرکەشە بەرزە لوتکە پر بەفرەکانی خۆشناوەتیو قەندیلو ئاکۆ ، چەند کاریگەر بووین لەسەر هەستو خەیالی دلدار .. ئەو وەسفو نووسینە بەرزەی دلدار لە شیعرە نازدارەکەی حاجی قادر دەچێ کە باسی بەهاری کوردوستانمان بۆ دەکاو دەڵێ :

وتم بە بەختی خەوالو بەسە ئەتۆبی خوا
لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا

گوررەی بەهاری یە ئێستێکە شاخو داخی وولات
پرە لە لالەو نەسرینو نەرگسو شەهلا

یا وەسفە جوانەکەی مامۆستا گۆران لە گەشتی هەورامانیدا کە دەڵێ

کۆمەڵە شاخێك سەختو گەردن کەش
ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش

سەرپۆشی لووتکەی بەفری زۆر سپی
بە دارستان ڕەش ، ناو دۆلی کپی

تادوایی ..

دووەم : حاجی قادرو نالی .

لە یادداشتەکەیدا دلدار ئەوەمان بۆ دەردەبری کە شیعرە نیشتمان پەروەرییەکانی حاجی قادری کۆیی و ، شیعرە ناسکەکانی نالی هۆیەکی گرنگی کاریگەر بوون لەسەر هەستو هۆش و بیرو خەیالی و بیخاتە دونیای شیعرو ئەدەبیاتی کوردی .. دەبا دووبارە گوێ لە دلدار بگرین کە دەلی : « لە کتێبخانەی کاکەم سەعدی دەستم پێکرد کە موتالەعات بکەم لە پێش هەموو شتێکا بە تەئریخی (سەورەی) فرانسەو تەئریخی بابان و سۆران موکریانی سەیر حوسێن حوزنیم بە کوردی خوێندەوە ئەمانە هەمووی دروشمی رابوردویان هێنامە بەرچاو لەگەل خۆما زۆر موجادەلەم ئەکرد مام بەرەبەرە میشکم بکەمەوە تەقدیری تەئریخ و تەنفیزی بکەم لەم تەئریخە بوو کە دیوانی نالیم زۆر بە وردی خوێندەوە شیعرە جوانەکانی نالی لەگەل شیعرە ئاگرینەکانی حاجی قادر لە مێشکمدا لەسەر زەعامەتی ئەدەبی شەریان بوو ... لەم شەرە شتێکیان بەمن بەخشی ئەویش بۆ شیعرو ئەدەبیات رواندمیان ، زۆر خەیالی وام لە میشکدا بوو کە حەزم دەکرد بەناو خەلقدا بەرپایان بکەم ، خۆم ئیمتیحان کرد کە ئەتوانم شیعر دابنێم ، شەویکیان تا درەنگ نەنووستم ، .. قەسیدەیەکی پانزدە بەیتیم دانا کە تەسەوری دایکێکم تێدا کردبوو . بۆ رۆلە لەسەورە کوژراوەکەی چۆن ئەگریا : ئەمە یەکەم شیعر بوو کە دامناوە ئێستا تێ ئەگەم ئایا بۆچی قەسیدەیەکم لەسەر تیلایی چاوی کچێکی جوان دانەنا ؟ ئایا ئیحساسم نەبوو ؟ یان لاو نەبووم ؟ بەلی هەم ئیحساس و هەم گەنجایەتیم هەبوو .. بەلام نالی کە بۆ دلداری رای ئەکێشام حاجی قادر کە بۆ نیشتمان پەروەری رای ئەکیشام ئەم دوو شا شاعیرانە هەردووکیان جیا جیا تەئسیری خۆیان لە دلم کردبوو بەلام موتالەعاتی تەئریخم ، موحیتە ئاگرینەکەم ، نەفسیەتی بۆ خزمەت تێنوم ئەمانە هەرسێکیان منیان بەلای حاجی دادا ، هەر کە ئەموپست غەزەلێکی غەرامی بلێم دەنگی پیرۆزی حاجی بەسەریدا ئەقیژاندم و ئەی فەرموو .

باسی زولفی دریژو چاوی بە خەو
نەبراوە بووە تری خەسرەو

دەستم لە قەلەم شل ئەکرد ، مەجرای تەفکیرم ئەگۆراند » .. دلدار هەر لە منداڵی یەوە خولیای زانین و ئەدەب و فەلسەفە بووە هەولی داوە شارەزایی پەیدا بکا لە سەرچاوەی ئەدەبی کلاسیکی و خۆی زۆر ماندوکردوە . سەیر دەکەیت لەو تەمەنە کەمەدا ، بەو لاویەتی و بەدەم ئەو هەموو ناتەواوی ژیان و نەخۆشیانەوە نیشانەی تواناو زیرەکی و هەستێکی دڵسۆزانەی قوول دیارە دانانی کۆمەڵێك شیعری بە سۆزی نەتەوایەتی و زانست پەروەری و کۆمەلایەتی و دڵداری و فەلسەفی و بابەتی ریالزمی نیشانەیەکی تری ئەو بەهرەو توانایەی دلدار دەردەخەن[٣٦] ..

مامۆستا رەفیق حیلمی لە کتێبەکەی « شیعرو ئەدەبیاتی کوردی » دا لەسەر شاعیریەتی دلدار دوواوە دەڵێ : ـ

« بەلای ئێمەوە دڵدار شاعیرێکە زۆر بالا ئەگەر لە هەندێ شیعریا ناپوختەیی هەبێ بەهای شاعیریەتی پێ ناشکێت ، منالێك کە هەموو ژیانی خۆی بە خوێندنەوە رابواردبی و هێشتا لە خوێندنی پێویستی « رەسمی » رزگاری نەبووبێ ناتوانێ ببێ بە شاعیرێکی (کەسبی) و بگاتە پلەی ئەوانەی کە شیعریان کردوە بە سەنعەت لەگەڵ ئەمەشا دلدار هەر لە مەکتەبی (ئیبتیدائی یەوە) دەستی کردوە بە شیعر ووتن لەم مەیدانەدا گۆی هونەری بردۆتەوە ، لەبەرئەوە ئێمە کەم وکورتی شیعرەکانی ئەومان نەگرتە بەرچاو بروامان هەیە بەوە کە شاعیرێکی (فطری) و خواوادە هیچ گومانی تێدانیە کە هەڵێکی باش و کۆلینەوێکی ئەدەبی ورد دلدار ئەکەێنێتە ریزی شاعیرە گەورەکانی کورد ، ئەویش لەوێ بوەستی لە لایەن بیری قوول و خەیالی وردەوە ئێستەش دالدار گەلی لە ژوور ئەو شاعیرانەوەیە کە هەندێ ووشەی رەق و تەعبیری ساردی وا ئەهۆننەوەو ئەیکەن بە (نظم) کە بە دیمەن و بیستن شیرین و رەنگین بەلام لە ماناو حەقیقەتدا پووچ و بێ کەڵکن ئێمە ناتوانین لێرەدا هەندێ شیعری دڵدار بنووسین کە زادەی بیرێکی زۆر قوول و زەکایەکی ئێجگار تیژن و لایشمانەوە ئەو شیعرانە وینەیێکی روون و رەوانی (تەفکیری عەسری) یە بەلام زۆر جێی داخە کە پێوەندی گرانی تەقالید ئیمرۆ رێ نادا بەبلاوکردنەوەیان زۆرتریشی ئەو جۆرە

شیعـرانه‌یـه‌تی که دلدارو شـاعیریـه‌تی بڵندی دلداری بـه ئێمه نـاسی ، ئه‌و شیعرانه‌ی که له هۆنینه‌وه‌و دروستکردنی ووشـه‌و ته‌عبیـری ره‌نگاوره‌نـگ‌و رێکخستن‌و یه‌کخستنی قافیه زیاتر کۆڵینه‌وه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی ژیانمان بیر ئه‌خاته‌وه وه چه‌شنی لێکدانه‌وه‌ی ئه‌م شاعیره‌مان تێ‌ئه‌گه‌یێنی که به‌ته‌مه‌ن منال‌و به مێشك گه‌وره‌و پێگه‌یشتوه .. »

ماموٚستا ره‌فیق حیلمی[٣٧] هه‌قی خوٚی داوه‌ته دلدار ده‌ربـاره‌ی شیعرو پایه‌ی شاعیریه‌تی ئه‌گه‌رچی له کاتێکا بووه که شاعیرمان هێشتا له دانیشگای (حقوق) بووه‌و خویندنی ته‌واو نه‌کردوه ، وه‌پاش ئه‌و مێژوه‌ش به‌رهه‌می ئه‌ده‌بی‌و شیعـری جوان‌و پتـه‌وی تری بـووه .. شیعره‌کـانی دلدار له بـاره‌ی شێـوه‌و ناوه‌روٚکه‌وه په‌یره‌وی شاعیری ناوداری کورد حاجی قادری کوٚیی کردوه ، که شیـوازی راسته‌وخـویی خیتـابی‌و ئـاموٚژگـاری کـردن‌و رێگـا نیشـانـدان‌و چاوکردنه‌وه‌یان پێوه دیاره وه مه‌به‌ستی ده‌ربرین‌و کارتێکردنی بیرو باوه‌ره‌که‌ی بووه .. دڵدار شاعیرێکی زاتی نه‌بو ، تا شیعر بوٚ ئاره‌زوو خه‌م‌و په‌ژاره‌و سکالا تایبه‌تی‌یه‌کانی خوٚی ته‌رخان بکات ، به‌ڵکو لای دلدار شیعرو خه‌باتی سیاسی‌و بلاوکردنه‌وه‌ی بیروړای نه‌ته‌وایه‌تی‌و هوشیارکردنه‌وه‌ی گه‌لی کورد ، ئامـانج‌و مه‌به‌ستی بنچینه‌یی بوه ..

دڵدار خـاوه‌نی هه‌ستێکی نـاسك‌و دڵێکی‌پـر سوٚزو شـه‌یـدای کـوردو کـوردستان بـووه په‌چـاوێکی روٚشنبیـرو دوور بـین سـه‌یـری کـه‌م‌و کـوٚری ناته‌واویه‌کانی گه‌لی کوردی کردوه له‌به‌ر ئه‌وه شیعری کردوه به چه‌کی ده‌ستی بوٚ مه‌به‌ستی بیروړای سیاسی‌و کوٚمه‌لایه‌تی ، جا ئه‌گه‌ر له هه‌ندێ شوێنا شیعری ساده‌و سووك‌و ره‌وانمان به‌ر چاو بکه‌وێت که به‌رگی هونه‌ری نه‌پوٚشیـوه ئه‌وه جێگای گله‌یی نه‌بوه وه له پایه‌و توانای شاعیریه‌تی که‌م ناکـاته‌وه .. ووتمـان حاجی قادر ئاسایی ته‌نیا مـه‌به‌ستی ووشیـار کردنـه‌وه‌ی خه‌ڵکی کـوردستان بووه .. چونکه باری کوٚمه‌ڵایه‌تی‌و دواکه‌وتویی کورد له‌پـاش حاجی قـادرا چ گوٚرانێکی ئه‌وتوٚی به‌سه‌را نه‌هاتبو مه‌گه‌ر له هه‌ندێ لایه‌نه‌وه نه‌بێ .. جا دڵدار ناچار بووه شیعر بوٚ چاره‌سه‌رکردنی ئه‌و ده‌ردانه ته‌رخان بکات وه‌ك له شیعری (ئه‌ی کورد) ئه‌مه ده‌رده‌خا که ده‌ڵێ : ـ

ئـەرێ ئـەی کـورد لە نێـو گـەلدا هـەتـاکـەی مـات و دامـاوی
کـە عالە م سـەربەخـۆن گشتی ئەتـۆش پەیـوەندی نێـو داوی

دەسـا بیـری لە حـالی خـۆت بکـەو هـەستێ بـە زیللەت کـە
بـەلێ دوێنیـکـە راوکـەر بـوی‌و ئێـسـتـاکـە بـە خـۆت راوی

دلدار لە سەرەتاوە لە شیعر هۆنینەوەدا پەیرەوی شاعیرە کلاسیکی‌یە ـ کانی کردوە[1] کە بایەخێکی زۆریان بە ووشەی فارسی‌و عەرەبی قەلەو قەلەو بە تویکڵ‌و ئالۆزکاو داوە ، خۆیان خستۆتە گیژەنی (عیلمی عروض) بـۆ ئەوەی قافیەی هەلبەستـەکەی یـەك بیتی هاودەنـگبێ جا لە پێنـاوی ئەوەوە مـاناو مەبەستیان پێ شێل کـردوە بەلام سـەیر دەکـەیت دلدار زوو خۆی لەو داوە راپسکاندووەو هاتۆتە مەلبەندی رۆمـانسی‌و چەنـد بەرهـەمێکی سەرکـەوتوی چنیوە .. ئەوەش ئەوە دەگەێنی کە خاوەندی بەهـرەو توانـایێکی شاعیـرانەی وابووە کە بەوە رازی نەبێت لە بـەرگی کۆت‌و بـەندی شیعـری چاولیکـەریدا بمێنێتەوە بەرەو ئاسۆی گەش‌و رۆناکتر هەنگاوی ناوەو رێگای تاقی‌کـردنەوەو داهێنانی گرتۆتە بەرو بایەخی بە لایەنی هونەری شیعرو زمان داوەو بە ئاشکرا لەم قۆناغەدا تابلۆی هەست‌و وینەی رەنگینی نوێی پێوە دەبینین[1] ئەم هەنگاوی تاقی‌کردنەوەو بەرهەمە نوێ‌یانەش زۆرتر لە شیعرەکانی (منـدالی هیوا گـولی سوور ، ئەی بادی شەماڵ ، خەندەکەی‌بایی ، کوردستان)

لە ناو هەموو ئەوانەشدا (خەندەکەی بایی) و (گولی سوور) زۆرتر هەوێنی هـونەری شیعـریان گـرتۆتـە خۆیـان‌و زیاتـر نیشانـەی بەهـرەو دەسـەلاتی شاعیرانەیان تێدایە .

خەندەکەی بایی لە رووی دارشتن‌و دەست‌پێ‌کردن‌و نەخشاندنی وێنەی دلگیـرو تابلۆی هـەستاوی‌و دەربـرینی تاسـەی شاعـیر وتەروپـاراوی زمان‌و لێچوونی چیژدارو دەنگ‌و مۆسیقاو رەنگ‌و بەراوردو هەوێن‌و هونەرە وردەکانی تری شیعرەوە پـارچە شیعـرێکی رۆمانسیـانەی تـەروبرو بـالایە... لە رووی ناوەرۆکیشەوە ئەگەر مەبەست هیوای مرۆڤ بێت لە ژیاندا[39] یـان دولبەرێکی

---

(٣٨) ل ١٠٨ کاروانی شیعری نوێ ـ کاکەی فەلاح ـ

شـۆخ و شەنـگ بێت وەك باس و بـابەت هـەلبژاردەیـەکی سەرکـەوتوانـەیەو کەرەسەیەکی نایابی شیعری‌یە .

خەندەکەی بایی

له ئـافـاقـی ژیـانـی نـاهـومـێدیم خـەنـدەکـەی بـایـی
فـریشتـەی پـاکـی هیـوامـی نیـشـانـدام وا کـە بیـدوێنم

پـریشکی تیشکی ئەستێرەی جوان ئیمشـەو بـە بـەئـەسپایی
بـە سـۆزیّ هـاتـە نێـو کـونجـی دلّی تـاریکی پـرخـوێنـم

دەسـا دەی مـەسـدەری هـەستـی
دەخـێـرا لادەری پـەسـتـی

«وەرە تا من بەرازی تۆنەمامی شادی بڕوێنم» لەکۆتـایی شیعرە کـەدا دەلی :

وەرە نـێـو ئـابـیـدەت تـا مـن لەبـەر پـێـت دابـدەم ئـەژنـۆ
لەبـەروەی نـا دلارامـی لەبـەروەی چـونـکـی بـالایـی

خـودای شیعـرو پـەری هیـوای بلێسـەی هـەستی بـەرزی تـۆ
هـەوالی هـاورِەگەو خـوێـنـی فـرشـتـەی شـۆخـی مـیـدیـایـی

لەرووی چـاکـەو وەفـاداری
بـە یـادی جـامـی دلداری

«له مـەستی خۆشی بمهێلی دروشمی خەنـدەکەی بـایی» وە لە شیعرە سەرکەوتووە رۆمانسی‌یەکانی دلدار شیعری « گولی سوورە » وە لەم شیعرەدا ئاخ و پەرۆشی شاعیر تەنها بۆ گولێکی ئاسایی هەلپچورکاوی بۆ مەبەستی جارێك بۆن کردن فرێدراو نیە .. بەلکو بۆ ئەو گولە سوورەی ئەورۆژە کە رەمزی کچی

(۳۹) کاروانی شیعری نویّ ـ کاکەی فەلاح

کوردە بیرو ئەندێشـەمان دەبـاتەوە سـەر مێژوی بـەسەرهـاتو ژیانی گـەلی کوردمان ؛ وەك لە سەرەتای هۆنراوەکەدا دەلی :

گـولی سـوور ئـەی کچی نـەورۆز ئـەرێ کـام دەس لە بـاغی ژین
لە بـۆ یـەك دەفعـە بـۆن کـردن بـە نـاکـامی ئـەتـۆی هێنـا

ئەوێستاکەش بە ژاکاوی
وەها بێقەدرو تۆزاوی
لەسەر رێگا فرێداوی

لە لایەکی تریشەوە[٤٠] ئەوەش دەگەیێنی کە دلیکی گەرمو پڕ لە ئارەزووی شاعیرێکی بە سۆزی ئاوی حەزو خـۆشەویستی تێنـوی وێلی کچێکی شـۆخ و نازداری دلرەقی کە بێ بەزییانە خستیە ژێر پێو پلیشاندی‌یەوەو ئەو دلەش بە فرمێسكو زامو شەرمەزاری و بێ هیوایی دلداری‌یەوە بە ناچاری گەڕایەوە ناو هێلانەکەی خۆی کە سینەی شاعیرە ئەمیش لە ئەنجامدا کە چارەنـووس ئەو گولەو بەسەرهاتی دلەکەی خۆی دەبینێت وەك دەلێ :

منیش ئەی گول دلیکم بوو
دلێکی پڕ لە ئارەزوو
بە سۆزی ئاوی حەز تێنوو

لە نـاکـاو لام فـری بـۆلای کـچـێـکـی دولبـەرو شـیـریـن
ئـەویش ریشـەی لەدەس‌گـرتـو بـەبێ رەحـمی لەژێـر پـێی‌نـا

بەگریاوی‌و بریندا ری
بەروو زەوردی‌و غەمخواری
بەبێ ئومێدی لە دلداری

گـولی سـوور ئـەی کچی نـەورۆز ئـەرێ کـام دەس لە بـاغی ژین
لە بـۆ یـەك دەفعـە بـۆن کـردن بـە نـاکـامی ئـەتـۆی هێنـا

(٤٠) ل ١١٣ کاروانی شیعری نوێ .

پاشان سەیر دەکەین بەپێی گۆڕانی باری سیاسی و فراوان بوونی ئاسۆی ڕوشنبیری دڵدار ، مەیدانی شیعر دانانی دەگۆڕێ و شۆر دەبێتەوە بۆ بابەتی ریالیزمی و دەکەوێتە وێنەکێشانی دیمەنی ژیانی چەوساوەکان ، شیعری (لالەباس) نموونەیەکی راستی ئەم جۆرە شیعرەیەتی کە وەك وێنەکێشێکی لێهاتوو تابلۆی ئادگاری جۆتیارێکی هەژارو رووت و پەریشانمان بۆ دەکێشی و دەلێ :

ڕۆژێکی پایز لە پێش نیوەڕۆ
لالە باسم دیت زەوی ئەدا تۆ
ڕووت و زگ والا پیرو تێك شکاو
پشتی چەماوە لووت لەسەر ئەژنۆ
گۆچانی دەسی دەستەندووی جووت بوو
دەنگی نووسا بوو بەهێ هێ و هۆهۆ

دڵدار لەم شیعرە ریالیزمەدا وەك بڵێی کامیرایێکی گرتووتە دەست واقیعی رووی ژیانی لالۆی جوتیاری هەژاری بۆ گرتووین وە لە کۆتاییدا دێتە سەر مەسەلەی دەروونی یەکەش کە دەلێ :

ئاگری دلی لە هەردوو چاوی
بلێسەی ئەدا وەك جووتێ پشکۆ

وە شیعری (توتنەوان) وینەیێکی تری شیعری ریالیزمی دلدار نیشان دەدا .

ڕۆژێکی هاوین لە قرچەی گەرما
ئاو دیرێکی ڕووت تووتنی ئاو ئەدا

زەردو بێ هێزو لاوازو نەخۆش
ماڵ وێران پەرپووت بەدەم لەرزوتا

کەپرێکی دارگەز نارێك دامەرزاو
بەپووش و گەلای چرو سەرگیراو

بۆ پاریزگاری خۆره تاوو تۆز
بەچیخبێکی شرسێ دەوری دراو

جەرکەیکی کۆن سێ گۆزەی کەرخێو
چەند هامانی رەش جامێکی قوپاو

یان کە دەڵێت : ـ
کە هاتم زگم کەوتە سەر زەوی
تووتنم چاندو رەنجی شانمدا

ئەلێم دار بکرە ئەلێم داو بێنە
ئەلێم برسیمە ئەڵێ پارە کوا ؟

من بەبێ پارەو منداڵم برسی
لە کوێ قوربێنم بیکەم بەسەرما

بەلای منەوە شیعری (ئەی رەقیب) بە نرخترین شیعری نیشتمـانیەو دڵداری بە هەموو کوردستان ناساندو هەتا هەتایێ ناوی لەسەر زارو هەستو دڵو دەروونی نەوەو گەنجانی کورد دەمێنێ ئەم شیعرە بەسەرهاتی خوێناوی میللەتی کورد نیشان دەدا ، بە دلێکی پڕ هەستی نەتەوە پەرستی چاوی بریوەتە ئاسۆی ڕوونی دووا رۆژی گەلی کورد ، بروای پتەوو هیوای سەرکەوتوو تینو تاوو جۆشو خرۆشی دەخاتە دڵی هەموو نەوە دلێرەکەی کە دەڵێ : ـ
با ناحەزانی کورد باش بزانن ئێمە رۆلەی میدیاو کەیخوسرەوین هەرگیزاو هەرگیز کۆڵ نادەینو نابەزین کورد نامـریۆو هەمیشـە بەرامبـەر کارەسـاتی سەختی ڕۆژگار سەرکەش وەك كێوی بیستون دەوەستێ ، چ هێزێك نیە لە ناوی

بەرێو هەر دەبێ بگاتە ئاوات و ئامانجی ، جا پڕ بەدەم روو دەکاتە رەقیب و دەڵێ : ـ

ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان
نای رمێنێ دانەیی تۆپی زەمان

ئێمە رۆڵەی میدیاو کەیخوسرەوین
دینمان ئاینمانە نیشتمان

کەس نەڵێ کورد مردوە کورد زیندووە
زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان

چەند هەزار لاوانی کوردی نەررە شێر
بوون بە قوربانی و هەموویان نبژران

دەتوانین بڵێین لە ناو هەموو شیعری شاعیرانی کورد کە پتر شوێنی خۆی لە ناو هەست و هۆش و دەروونی نەوەی کوردا گرتبێ دوو پارچە شیعرن : ـ
یەکەم شیعری (ئەی رەقیب) دووەم شیعرەکەی پیرەمێردی نەمرە کە بەبۆنەی نەورۆزەوە دایناوە کە دەڵێ : ـ

ئەم رۆژی سالی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بە هاتەوە

## ئەی ڕەقیب

- کەرکوك -

ئەی ڕەقیب هەرماوە قەومی کورد زوبان
نای ڕمێنێ دانەیی تۆپی زەمان

ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوورو شۆڕشین
سەیریکە خوێناویە ڕابوردومان

ئێمە ڕۆڵەی میدیاو کەی خوسرەوین
دینمان ئاینمانە نیشتمان

کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە[1]
زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان

چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕرەشێر
بوون بە قوربانیو هەموویان نێژران

لاوی ئێستاش حازرو ئامادەنە ...
جانفیرانە جانفیدانە جانفیدان

لاوی کورد هەڵسانە سەرپێ وەك دلێر
سا بە خوێن نەقشی ئەکەن تاجی ژیان

کەس نەڵێ کورد مردووە کورد زیندووە
زیندووە هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان .

## ـ ئەی لاو ـ

ئەرێ ئەی لاو لەهیچ وەختێ نەکەی مەئیووسی ژینت بێ
دەبێ هەردەم عەزم‌دارو دەوای دەردو برینت بێ

لە مەیدانی تەقەدومدا تەلاش ئەسپی نەجاتت بێ
لغاوی ئەسپەکەت (فکر) و (علم)و ئاوزینگەو زینت بێ

بەڵێ دائیم هونەرمەند بە لە مەیدانی نەبەردیدا
بەهۆی عەقڵو هونەرمەندیت دەبێ تیشکی زەمینت بێ

لە ینۆگەلدا ئەبێ ئیعلانی جەنگی کەی لەگەل جەهلا
عیلم چەك بێ لە ئەم جەنگە وەتەن جێگای کەمینت بێ

لە رێگای شانو بەرزیدا دوور ئەندێشێکی وریابە
مەنافیع پەروەری میللەت ئەبێ ئامانجی ژینت بێ

نەکەی بۆ بەرزی ئامانجت برای خوێنیت لە بەندی کەی
بە بەرزی شادو مەسروور بە نزمی ژینی شینت بێ

لە وەختی گەنجی گەنجیدا دەبێ رەنجێکی گەنجین دەی
نەوەك وەختت برەنجێنی لەنێو جێگاو نوێنت بی

لە دنیادا هەقی ژینت هەیە تاکو نەفەس دانێی
بەڵام چاکەو رەوشتی چاك دەبێ ئایینو دینت بی

برای تۆنە هەموو کوردێك وەکو والەن کە ناچەی‌کەی
نەکەی دڵ پیسو جوێندەر بی بەرامبەریان وەڕینت بی

ئەگەر لاوێکی (کوردی) تۆ دەبێ دڵ پاكو باڵا بی
نەوەك دڵداری دڵ پەروەر دڵت قورئانی دینت بی

## ئیش[49]

کەرکوک «١٩٣٩»

دڵ بە دوو ئەفسانە کەوت و وای ئەزانی وائە بێ
ئیشی دنیا ڕەنجی بێناوێ بەخۆی کۆتا ئەبێ

ئەی دەزانی ئەو بە (ئارەق)[50] داری ئومێد ئاو بدا
گەر بەخوێن پەینی بکا ئەوسا سەمەر پەیدا ئەبێ

لەفزی (نابێ) نابێ بیزانی کە لاوی کوردی تۆ
هەر بەکۆشش دێتەبەر باغی ئەمەل ئیحیا ئەبێ

(طالع)و (ئیقباله) وەهمی پایە بەندی بێ هونەر
عەزمی مەردانەت ببێ هەرچیت نیازبێ وا ئەبێ

ئەی برا لادە لە فکری کۆن و زوو سا ڕاپەڕە
کارەکەت چارێك بخە ، ڕەنجت هەبێ خۆی چا ئەبێ

مردنە ژینت بەبێ کاری ، لە سستی لابدە
هەر بە ڕەنجی لاوی وەك تۆ ، نیشتمان ئاوا ئەبێ

(٤٩) لە گەلاوێژ بڵاوکراوەتەوە

(٥٠) مەبەستی ئارەق ، ئارەقەی ماندوو بوونە

## لەگەڵ (جاهد)
## یە یەکەوە دایان ناوە

رانیە ١٩٤٣

شەهبازی یا شەهێنی ، شاهی یا شەهلاری تۆ
بێ دڵی بێ مروەتی عاشق کوژی خوینخواری تۆ

زاڵمی غارەتگەری تاڵانبەری تۆ بۆ گیان ودڵ
لەشکری تاتاریە د.وو زوڵفەکەی تاتاری تۆ

حاکمێکی مەست و بێباکی ئەبەد رەحمت نییە
مائیلی (فتانیە) دوو چاوەکەی سەحاری تۆ

ئەنوەرە بۆ گشتی عالەم زوڵەتی دوو زوڵفەکەت
زوڵەتە بۆ من بە تەنها ئەنوەری ڕوخساری تۆ

بەسیەتی جا ئەی سەنەم با باری میحنەت لا بەرین
کەعبەکەچ نابێ کە ساتێ بێینە نێو گوڵزاری تۆ

مەجلیس مەستی ببەستین خۆم و خۆت ئەی نازەنین
کەی ئەبێ جارێ ببم من مەستی شەککەرباری تۆ ...

قەت نەکەی (جاهد) مەدەد لەم شۆخی وا کەچ مەزهەبە
چونکە (دڵدارم) ئەزانم نایەتە هاوارێ تۆ ...

## ئومێد

هەولێر ١٩٣٥

چاوەکانم لێڵ و وێڵ بوو کوا ؟ ستارەم دەرنەکەوت ؛
دڵ لە تاوی دەردی گڵپەی سەند وەکو ئاورو نەوت

ڕۆژهەڵات و زیندەگی دا گشتی عالەم کەوتە ئیش
چاوەنۆری ئوفقی دوورم ڕۆژی من کوا ؟ دەرنەکەوت

ئەی خودایە تاری نیگبەت کەی ئەبێ لاچێ خودا ؟ !!
تابەکەی چەنگەچڕێ من سا لەگەڵ تۆ هەشت و حەوت

بەسیەتی دڵدار زەمانی شیعری بێ مەعنا نەما
هەڵسە چارەی دەردەکەت کە بێ (تفکر) ڕێگە چەوت

بێتو ئەسپێ چەند ئەصیل بێ سواری چالاکی نەبێ
قابیلە دەرچێ لە مەیدانی جداڵ و جێگە ڕەوت ؟ !!

## بۆ ئەوکەسەی کە ...

لە بن سایەی چەمەنزاری بەهاری
باپێکەوە بین یەك دڵ و ڕووخۆش
دڵ ڕوون و خرۆش با ڕاوێ بکەین سا
هەڵبەستە من و تۆ دڵی پڕجۆش
تەنهایی بیابانێکی پڕ سۆز ...
جا لە ڕێوە ئاوازی زەمین‌سویی سروور
سا بەسیە غرور . ساتێ ببیەین سا
من نەی‌دەمێ دڵداری و تۆ دەنگی طیور
خدمەتچی نیازمانە شتومەك لە ژیان ...
توحفەی دەسی دڵداریە بانرخ و بەها ...
پەرویزو (معلاّ) کاتێ بچینین سا ...
من بەستەی بەرجوستە و تۆ نێرگزی شەهلا
پڕ زەمزەمە باغێکە زەمین تۆم هەبێ بەدەم ..
خۆش نشووە چە جامێکە ژیان ساغری گلکۆن
تۆ شعری (مجسم) . من شاعیری (ملهم)
تۆ (حسن وفسون) من هەمدەمە مەفتوون[٥٢]

## - ڵ -

## لەگەڵ (عەونی) بەیەکەوە دایان‌ناوە

«کۆیە»

دڵ لە بەینی تەلعەتی روو زوڵفەکەی دەیجوورتە
گاهێ مەیلی شەو ئەکات و گاهێ مەیلی نوورتە

بەحری عومانی سروشکم وا بەدەم گریانەوە
پڕ لە دانەی گەوهەرە هەم لەعلی وێنەی سوورتە

بادەکەت پڕ ژەهری مار بێ پێم‌بدەی نۆشی ئەکەم
چونکە تەبعم هێند موتیعە بەندەیی مەیسوورتە

سا ئەزانی چەند پەشێوە ئەو دڵەی بێماری من
پەی‌کراوی تیری غەمزەی چاوەکەی مەخموورتە

ئاسمانی حوسنی ڕوخسارت لە ئەبرۆ چەرخی ڕوو
تاقی ئەبرۆت دوو هیلال و چەرخی کوڵەت خۆورتە

غونچەکەی نەشکفتەیی لێوت لە باغی مەقسەدم
تا دەمی پشکوتنی دڵ بولبولی (منظور)تە

ئارەزووی ئەم شیعرە (دڵدار) تۆ لە (عەونی) بۆ ئەکەی
چونکە ئەم غەمبارە دائیم بۆ وەتەن مەجبوورتە

## مەی

کەرکوک ـ ١٩٣٨ ـ

مەی لەبەردەم بێ کەئیمرۆ عادەتێکی جاریە
عادەتی چی ؟ ... موئینسی چی .. ؟ پیشەی بێکاریە

جامی یەکەم فرێنەکەیت هەستی دڵشادی دەکەی
شادونۆشی چی بێ یاران ... عیللەتێکی ساریە

عیللەت سیحەت ئەبا ، غارەتگەرێکە ، نیگبەتە
لازمە تەسلیمی کەی ، تەسلیمیکەی ، ناچاریە

هەرکەسێ ئیدمانی (مەی) کرد خۆی ئەخاتە داوەکەی
ئاخیری هەر ڕەنجەڕۆیە هەم لە عیزەت عاریە

فەرقی ئینسان و وولاغ ئەندێشەیە ، ئەندێشەیە
بۆ نەمانی عەقل و ئیدراک مەی دزێکی کاریە

چەند کەسێکم من ئەناسین خاوەنی جاهو شەرەف
ئێستە مەنکوبی شەرابن پیشەیان غەم خواریە

سیحەت و ماڵ و شەرەف ڕۆیی لەباجی بادەیان
عەیش ونۆش هەر زیللەتە تا ئاخرەت یەکجاریە

ئەی نەکەی گیانە بنۆشی ئەم ئەداتەی موخەربیە
چونکە ناوی خۆش و کاری عەینی ژاری ماریە

# کوردستان(٥١)

بەغدا ١٩٤٠

کوردستانی خۆش ، نیشتمانی جوان
تۆ قیبلەگاهی منی بێگومان
چاوم پشکووتووی شاخەکانتە
فێری سەیرانی باغەکانتە
دەنگی شمشاڵی شووانەکانت
زریوەو باقی جووانەکانت
قاسپەی کەوانی قەد کێوەکانت
خورەی ئاوەکەی نشێوەکانت
ئەمانە هەمووی گوێیان کردمەوە ...
هەوێنی شیعری دڵیان گرتمەوە
من درەختێکم لەو خاکە ڕووام
بەخۆشەویستی تووە ئاودرام
بەڵێ کوردستان تۆ منت خوڵقان ...
تۆمنت خوڵقان پێت بەخشیم ژیان
خۆش ژیانم خۆشی ژینتە
ئێشی ژینی من ڕۆژی شینتە
چونکە کوردستان ، کوردستانی جوان
قیبلەمی دینمی خوامی بێگومان !

---

(٥١) لە گەلاویژ بلاوکراوەتەوە .

## ـ لە مەیانی مجادەلەیەکدا ـ

ڕانیە ١٩٤٣

کەسێ کەس بێ لە دونیادا کەساسی دەستی دەورانە
لەژینا ناکەسی بەدکار لەجاهی عزەت و شانە ...
گوناهی کەسێ ئەبێ چی بێ بە غەیرەز کەسبی سەربەرزی
بەقەد خەندەی کەسی ناکەس ئەوەندەش ئەو لە گریانە
برا نابێ تەعەجوب کەی لە وەزعی ناکەس و دوو ڕوو ...
کەوا ئەفلاک و گەردوونیش وەکو ڕووی ئەو لە گۆرانە
تەبیعەت قاعیدەی وایە لەگەڵ گۆڕاو برادۆستە ...
ئەوی سابیت بێ ساکین بێ لە بەهرەی ژینی حیرمانە

ژیان خەونێکە ئەیبینین بە تیژی دێت و ئەڕواتن
لە پەنهانی نیهانیدا ئەوی دانابێ نادانە ! ...
لەهیچیدا بەدی هاتی ، بەرەو هیچیش ئەڕۆی غافل !
لەبەینی هەردوو هیچیدا خەراباتی بژی گیانە !! ..
عیبادەت چی بوو نەتزانی بە غەیرەز نێرەبیدۆشە
سەری خۆت بۆ دێشێنی سەفا نسیانە نسیانە ...
بەمەستی خۆت لە پەستی عەقل و ئەندێشە تەوەللاکە ...
ئەوی ڕۆییوە ڕۆییوە ئەوی نەبووە لە پەنهانە ...
ئەرێ ئەی یاری تەنهاییم ، نەدیمی هەمدەمی پەستی
لەگەڵ تۆم ساقی هەموار و خەلیفەی پیری مەیخانە ...
دەسا کوا جامەکەی دوێنێت کە قووتی گیانی تێدا بوو ...
دەخێرا تەی‌کە بۆم چونکە لە پەستی مەستی دەرمانە ...
دەسامەی جامەکەی جامی سەری کەی بێ فەلاتون بێ ...
بنۆشە باوەڕیت وابێ کە لەم کاروانە کار ... وانە

# «ئەی خودایە»

کەرکوک ١٩٣٧

ئەی خودایە حاڵی عالەم حەقی شایانی نیە
میحنەت و ئیدباری زۆرو شەهدی بێ ژانی نیە
سا ئەزانی بۆچ ئەمن وا معرەضی شەکوا ئەکەم
تابزانی قودرەتی تۆ حەددی ویجدانی نیە

زامەکەت بێ مەرهەم و بۆ گشتی عالەم ساریە
دەردەکەت زۆر نیشەدار و قەتعی دەرمانی نیە

ڕێگەیی بەش‌کردنی ڕزقت لە دونیا شاهدن ..
هێندی کەس ئەفرادی لۆرت و هێندێ کەس نانی‌نیە

ڕۆژێ فەرمووت (لیس للانسان الا ما سعی) ...
هیچ کەسێکیش هێندی فەللاح ئیش و کێلانی نیە

ئیش ئەکات و ڕەنج ئەدات و ڕوتوقووت وزگ بەتاڵ
ئاخری بێ‌سوود ئەمێنێ ساڵ کە بارانی نیە

ڕائەمێنێ ڕەنجەرۆو دەست لە ئەژنۆ قوڕبەسەر
ڕاستە شاهی بێ شەریك باكی گەدایانی نیە

سا لە ڕێگەی ژین دزینی مەڕ ئەکا گیسك ئەبا
چونکە برسی و بێ نەوایە مایەیی نیە

ڕۆژێ هات و ڕوحی دەرچوو لاشەکەی کەوتە «شری»

لێی ئەدەن بەم گورزە گەورە وا کە ئیمانی نیە

سا بەسایەی قودرەتت بوو ماڵەکەی بێ بەهرەما
خۆ قەزا بوو سرقەتی کرد ڕاستە گومانی نیە

بۆچ لە دونیا ڕەنجەڕۆ بێ بێ نەوابێ ئاخیرەت ... ٠
چونکە وەك من غائیلەی دڵ عزەتی گیانی نیە

گەر لە ئەفلاکا هەبایە حاکمێکی تر بەرقەرار ...
سا ئەچووم ئەمووت «خودای من سوودی ئینسانی نی‌یا

ڕەنگە کەم دیدەو مەلایان هانی خەڵقی وابدەن
کوشتنی دڵدار حەڵاڵە چونکە ئیمانی نی‌یە

# ئەی نازەنین[٥٤]

بەغدا ١٩٤٢

ئەی نازەنین ، ڕەوای تەونجی نازەنین ، خۆ تازەنین
بیستم ئەڵێی کە بێ وەفام
بێشەرم و ڕەنگ ڕووەڵام ...
لە بانێکا هەزار هەوام
بەڵام ئەگەر بەم چەشنەبام
لەم سەنگەساریە چۆن ئەمام
بەڵێ لە لای ناحەز وەهام
بەڵام ، بەڵام
ئەمن گیرۆدەی داوی تۆم
گیرۆدەی زوڵفی خاوی تۆم
دەبەنگ و مەستی چاوی تۆم
مەلێکی باڵشکاوی تۆم
بەشێتی ناو زڕاوی تۆم
خودا پەرستی ناوی تۆم

---

(٥٤) لەگەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە .

ئەی ، یاری خۆم

که تیشکی تۆم له ڕوو ڕژا
گوڵی ئومێدی پێ بوژا
زوخاوی پەستی لێ ڕژا
عالەم له تاوا پێ هەژا
شێت بوو بەجارێ تێك قژا
هەمانەی پەندی هەڵرژا

چ هەلرژا !!!

جا جاڕیدا که سەرسەریم
لەرەوشتی چاك بێ بەریم
ناوی زرانوه بەدفەریم
بێ عەقڵ و لاملی ، کەریم
دوو ڕوو دووپشت وزۆر وەریم
نیشانەی چاکەو بێبەریم

دەربەدەریم

ئەی نازەنین ، ڕەوای ئەم تازه نازەنین ، خۆتازەنین

